# ڕشتە مرواری





کۆمەڵە ئەدەبییێکی هەرە بەنرخە
لە فەلسەفە و بیر و باوەڕی کوردی

عەلائەدین سەجادی



| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | سجادی، علاءالدین، ۱۹۰۷ - ۱۹۸۴م. |
| عنوان و نام پدیدآور | : | ڕشتەی مرواری: کۆمەڵە ئەدەبییکی هەرە بەنرخە لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی/ دانراوی عەلالەددین سەججادی. |
| مشخصات نشر | | سنندج : کردستان ، ۱۳۹۹. |
| مشخصات ظاهری | | ۸ ج.؛ ۲۱/۵×۱۴/۵ سم. |
| شابک | | دوره : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰--٤۱۱-۸ / ج۱ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰٤۱۲-۵ |
| | | ج۲ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰--٤۱۳-۲ / ج۳ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰--٤۱٤-۹ |
| | | ج٤ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰--٤۱٥-٦ / ج٥ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰--٤۱٦-۳ |
| | | ج٦ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰--٤۱۷-۰ / ج۷ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰--٤۱۸-۷ |
| | | ج۸ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰--٤۱۹-٤ |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | شوخی‌ها و بذله‌گویی‌های کردی-- عراق-- قرن ۲۰م. |
| موضوع | : | Kurdish wit and humor-- Iraq -- ۲۰th century |
| موضوع | : | داستان‌های طنزآمیز کردی |
| موضوع | : | Humorous stories, Kurdish* |
| رده بندی کنگره | : | PIR۳۲۵۶ |
| رده بندی دیویی | : | ۸فا۹/۲۸۲۶۲ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۷۶۲۸۵۳۱ |
| وضعیت رکورد | : | فیپا |

# ڕشتەی مرواری

-٥-

کۆمەڵە ئەدەبییێکی هەرە بە نرخە
لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی


دانراوی:

**ماموستا عەلائەددین سەجادی**





انتشارات کردستان

سنه



# ڕشتەی مرواری

## ـ ٥ ـ


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | ڕشتەی مرواری |
| ✓ دانراوی (مؤلف): | مامۆستا عەلائەددین سەججادی |
| ✓ پێداچوونەوە و هەڵەبژێری: | ژیلا قەوامی / ڕەفیق ڕۆستەمی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ١٣٩٠ ـ ٢٠٢١ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ١٠٠٠ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ٢٠٧ لاپەڕە (صفحەی رقعی) |
| ✓ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کُردستان) |
| ✓ شابک: | دوره: ٨ ـ ٤١١ ـ ٩٨٠ ـ ٩٦٤ ـ ٩٧٨ ـ شابک جلد (٥): ٣ ـ ٤١٦ ـ ٩٨٠ ـ ٩٦٤ ـ ٩٧٨ |





سنندج، چهارراه شهدا، پاساژ عزق، انتشارات کُردستان، تلفن: ٠٨٧ ٣٣١۶۵٣٨٢

سنە، پاساژی عیززەق، بڵاوکردنەوەی کوردستان، تەلەفوون: ٠٠٩٨ ٨٧ ٣٣١۶۵٣٨٢

# ناواخن

# سەرەتا

## لە هەر تەڵە ئاوازێك و لە هەر سازە نیازێك

ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە. ڕۆژ ئەڕوا و مانگ دێت؛ مانگ ئەڕوا و ساڵ دێتن. خۆزگە بەو ڕۆژانە کە هەر ڕۆژێکی وەکوو مانگێك بوو! ئای بۆ ئەو مانگانەی کە هەر مانگێکی وەکوو ساڵێك بوو! کورە چۆن قسەی وا ئەکەی؟ خۆ ئەڵێن: ڕۆژی ناخۆشی بە مانگێکە و مانگێکی بە ساڵێك.

ئەمە ئەڵێن، بەڵام بە دینت ڕۆژانی منداڵی ڕۆژی ناخۆشی بوون؟ کە لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ وەکوو ساڵێك بوو. خۆ لە بەیانییەوە ئێوارێ هەر نەدەهات.

ئۆ! خۆزگەت پێی، بەوەی قسەی پار ئەگێڕیتەوە.

برا، نە منداڵی و نە گەورەیی، ڕۆژێك ئەگەر ئیشێکت تێدا کرد ئەوە گەلێ بە کەڵکترە لە ساڵێك کە هیچ ئیشێکی تێدا نەکەیت.

با بێینە سەر «ڕشتەی مرواری». ئەمە بەرگی پێنجەمی ڕشتەی مروارییە لە بەردەستایە. بەرگی یەکەم و دووەم لە ساڵی(١٩٥٧)دا چاپ کران. هی سێیەم لە ساڵی (١٩٥٨)دا. هی چوارەم لە ساڵی(١٩٦٩)دا. ئەمەیە پێنجەم کە بەر ساڵی (١٩٧٢) کەوت.

تا ساڵی (١٩٧٢) گەلێ پەردە گۆڕا و گەلێ چەشنە دێوجامە هەڵدرایەوە. لە ماوەی ئەم شانزە ساڵەدا ئاخۆ چەند جۆرە دەستکردی پیشەسازی

هاتۆتە پێشەوە؟ ئاخۆ چەند جۆرە شۆڕش گێڕرابێ؟ هەریەکە بۆ شتێك. ئاخۆ چەند کەشتی بەرز بووبێتەوە بۆ مانگ و بۆ ئەستێرەکانی‌تر؟ کەچی خاڵۆی ڕێبوار ئەڵێ:

مامۆستا تازە ئەڵێ: ئەوا ڕشتەی مرواری! و تازە ئەگەڕێتەوە بۆ گێڕانەوەی ناوێك کە ناوی ڕشتەی مروارییە و شانزە ساڵ لەمەوپێشتر ئەم ناوە دانرا، یاخوا ناودار بێ و بە نازی دایك و باوك گەورە بێ!.

یاخوا ئەو قەڵەمە و ئەو زمانەت نەڕزێ و نەسوێ، قسەی خۆت بکە و بەردی خۆت بهاوێژە، من بە تۆ و تۆ بە خوا.

لەم ڕووەوە کە مامۆستا و تۆ وەیا من و تۆ هەردووکمان لە نەتەوەیەکین کە کوردین، ئەوە گومانی تیا نییە. هاوبەشین لە هەموو ئەو شتانەدا کە لە ژێر خێوەتی نەتەوایەتیدایە و منیش کەواتە لەگەڵتم بۆ ئەو قسانەت. بەڵام لە لایەکی‌ترەوە ڕەنگبێ تۆزێ لە یەك دابڕێین، من ئەڵێم: نەتەوە کاتێ پێی ئەخاتە مەیدانی نەتەوایەتییەوە کە زمانێك و ئەدەبێکی هەبێت. وە ئەدەبیش هەر ئەوە نییە کە نووسراو و هۆنراوەیەك بێ کەوتبێتە ژێر پەردەی مەعنایەکی ڕەقەوە؛ بەڵکوو بەشێکی زۆر لە ئەدەب، ئەو ئەدەبە فۆلکلۆریانەن کە بە زمانێکی سادە و ساویلکە وتراون و ئەوترێن. ئەمانەن کە بە تەواوی زمانەکە دەرئەبڕن و پتەوی ئەکەنەوە. ئەو زمانە ئاشکرا و بێ‌پەردەیە، نەیەتە مەیدانەوە، جەوهەری ئەدەبی ڕاستەقینەی ئەو زمانە ناکەوێتە ڕوو و دەرناکەوێ.

ئەگەر لە لاپەڕەی ڕابردووی مێژووی ئەم شتانەدا کە ئێستا ئێمە لە بارەی زمان و ئەدەبەوە پیشانی ئەدەین، بەرە بەرە لەو سەردەمانەدا پیشان بدرانایە، بێگومان ئێستە ئازوخەیەکی زۆر تێروتەسەلمان ئەبوو بۆ ئەم زمانەی خۆمان و نەئەکەوتینە بەر پلاری ئەو توانج و ڕەخنانە

کە تێمان و لێمان ئەگیرێ. بۆ ڕاستی و ناڕاستی ئەم قسەیەش هەر ماوە ئەوسەر و ئەمسەری ئەم شانزە ساڵە بێنەرە پێشەوە، لە سەری شانزە ساڵەوە ئەگەر یەکێ ڕشتەی مرواری چاو پێ بکەوتایە وەکوو فیشەکە شێتە ئەچوو بە عاسمانا؛ کەچی لەم سەری شانزە ساڵەکەوە دەمی بۆ ئەتەقێنێ.

دیسان ئەیڵێمەوە کە من وەیا زانین بڕوای وایە ئەگەر ئێمەی کورد لە ڕۆژەکانی کۆنمانا دەستێکمان بۆ خۆمان ببردایە، ئێستە لەو پلانە تێپەڕیبووین و دوور نەبوو دەستێکیشمان بە کەشتییە ئاسمانییەکەوە بگرتایە.

کەوابوو برای برام! وەکوو من سەرم لە ڕەخنە نەکردۆتەوە تۆیش سەری لێ مەکەرەوە «ئەگەر لەکین، گشت چون یەکین». ئەم زمانە، زمانی ئێمەیە، ئەم ئەدەبە ئەدەبی ئێمەیە. وا مەزانە ئەم جۆرە شتانە تازە کورە وەیا لەناو نەتەوەکانیترا نین، زۆر هەیە، بەڵام ئەوان زووتر دەستیان دایە و زووتر پلەی «عەیب و شوورەیی»ـیان بڕی. ئێمەش ئەبێ لەسەر ئەو بڕوایە بین تا ئەدەبە ئاشکراکانمان زیندوو نەکەینەوە، ناتوانین بە تەواوی بگەین بە جەوهەری ئەدەبی بناغەیی؛ ئەدەب ـ با ڕوخسارەکەشی جیا بێ ـ بەرانبەر بە نەتەوە لە هەموو بناغەیەك بناغەترە، لە هەموو شۆڕشێك شۆڕشترە. هەر لەبەر ئەمە بوو منیش لەم ماوە تۆزێ پان و درێژەدا ئەم شۆڕشی ئەدەبییەم خستە ناوەوە.

ئا، برا تۆ دەنگ! هیچ دێتە بیرت ئەو ساڵە کە لە مێرگەکەی «هەوارەپان» بووین مەشکەیە دۆمان بردبوو بە نانی هەرزنەوە ـ خوا نەیوڕێ ـ کردبوومان بە زلیاوپلیاوێك؟ ئێستەش هەر وابزانە سەر و ژوورەکەی هەوارەپانە بینی پێوە نێ و تا لەوپەڕیەوە دەرئەچی، وازی لێ نەیەنی ئەگەر جارجاریش قسە بکەی گەردەنت هەر ئازاوێ. توخوا براله و توخوا بووکی بەر کەندوان،

تۆیش گەردەن من ئازاکە، ئەمە کۆرپەی گوێئاگردانە. تووتن بریاگ و تووتن دزیاگ وەکۆی زوخاڵ وێ! با ئەم تۆ بدوێنێ و تۆیش ئەو بدوێنە.

ئیتر خوات لەگەڵ تۆ وە خێر و من وە سەلامەت! بەڵام نەك سەلامەتەکەی شێخ بابەعەلی.

**عەلائەددین سەججادی ـ بەغدا**

**١٩٧١/١٠/٥**



# گەنجی درەخشان

١. کاك هەژار گێڕایەوە و وتی: «جەهانگیرئاغای دەوەشاری» پیاوێکی جوان و کەڵەگەت و شۆخ و شەنگ بوو. ڕۆژێك ئەچێتە ورمێ لەسەر جادەیەکا سەیر ئەکا وا ئافرەتێکی پاشەڵ گەردەڵی دەرپێ تەنگی سمت پڕ لە پستان لە پێشیەوە ئەڕوا. ئەمیش شوێنی ئەکەوێ. لە پاش ماوەیەك لە پشتەوە دەستێك بۆ ئافرەتەکە ئەبا، ئافرەت ئەگەڕێتەوە ئەوی بشێ و نەشێ لە جنێودان، لە فەزیعەت بە جەهانگیرئاغا هیچ درێخی ناکا. ئەمیش هیچ دەنگ ناکا تا ئەو بە تەواوی ماندوو ئەبێ، ئەمجا پێی ئەڵێ: «بەخوا دایکم تۆش هەقتە؛ من لەبەر قەرزاری و پەرێشانی خۆیشم نازانم چی ئەکەم!».

٢. لەو ناو مەنگورایەتییە ژنێك هەبوو «شەمێ»ـی ناو بوو. ئای ڕاست ئای درۆ، شەمێ ناوی بە خراپ دەرچووبوو. ڕۆژێك خزمەکانی شەمێ و بوختانکەرەکان بە تفەنگ ئەنیشنە ناو یەك و دەست ئەکەن بە کوشتاری یەك. شەمێ کە وا ئەزانێ هەڵدێت و ڕووبارێك ئەبێ لە ڕووبارەکە ئەپەڕێتەوە، لەو کاتەدا زەلامێکیش لەوبەر ئاوەکەوە دێت و گوێی لە تەقوهۆڕی تفەنگی ئاوایی ئەبێ. لە شەمێ ئەپرسێ: دایکم ئەم تەقە و کوشتار و هەرایە لەسەر چییە و بۆ چییە؟ شەمێش ئەڵێ: «بەخوا برام ئەوە هەمووی لەسەر شەمێیە و شەمێش ئاگای لە هیچ نییە».

٣. ئەحمەدی براحەمە بۆی گێڕامەوە وتی: ئەوا لەو ناوچەی خۆمانەدا دنیا پەلپەل بووەتەوە و هەرکەسە لە ئاوازێك لێ ئەدا. خەڵکی بەرە بەرە بووەتەوە، هەر بەرەیەك بیروباوەڕێکی هەیە، زەمان حزب و حزبکارییە. وتی: لە کۆڕێکا بووین کۆڕەکە هەریەکە وەکوو تەڵی کەمان لە ئاوازێکی لێ ئەدا ئێمە لەو دەمەقرە و مشتومڕەدا بووین سەیرمان کرد کابرایەکی کوردی گالۆك بەدەست ـ قەفی گالۆکەکەی خستبووە مەچەکیەوە ـ هات و لە تەنیشتمانەوە دانیشت. ئێمە هەر لە دەمەقرەی بەرە و بەرایەتی خۆمانا بووین ئەویش وا بە سۆز سەری شۆڕ کردۆتەوە بە خۆیا و گوێ لە قسەکانمان ئەگرێ. پاشان ڕوویان تێکرد و وتیان: برا تۆ لەم ڕووەوە بۆچ قسەیەك ناکەی؟ وتی: برا قسەی چی بکەم؟ قسەی من لەسەر ئەم دەمەقرە و مشتومڕەی ئێوە وەکوو قسەی ژنەکەیە لەگەڵ کوڕەکەیا. وتیان: ئەو قسەیە چۆن بووە و چییە؟

وتی: لەو وڵاتی لای ئێمەیە ژنێك هەبوو دوو مێردی کردبوو، هەردووکیان مردبوون. مێردی سێیەمی کرد لەم مێردەی کوڕێکی بوو؛ ئەم مێردەشی مرد. ئیتر مێردی نەکردەوە دانیشت بەلای کوڕەکەیەوە گەورەی کرد و کوڕە بوو بە پیاو. کوڕەکەی ئەیزانی دایکی پێش باوکە جوانەمەرگەکەی ئەم، دوو مێردی تری کردووە. ڕۆژێك هەروا دانیشتبوون دووبەدوو، کوڕەکە لێی ئەپرسێ: توخوا دایە لەو سێ مێردە کامیانت زیاتر بەدڵ بوو؟ دایکی هیچ دەنگی نەکرد. کوڕەکە لێی پرسییەوە و وتی: ڕۆڵە واز بێنە لەسەر شتی وا مەڕۆ. کوڕەکە هەر وازی نەهێنا دایکەکە کە زانی هەر واز ناهێنی وتی: «ڕۆڵە گوو بە گۆڕی هەرسێکیان». کوڕە واقی وڕ ما و وتی: دایە بۆچی؟ وتی: «ڕۆڵە هەرکامیان ئەهاتن ئەوەندە لنگیان ئەگرتم بە شانەوە و بەرزیان ئەکردەوە لەوانەبوو هەردوو گونیشیانی تێخەن؛ لە

هیچیان من خێرم نەدی».

ئەمەیە قسەی من، دەمەقرەی لەسەر ئەم دەمەقرەی ئێوە.

٤. دوو کچی سەرە لەو سەرە دانیشتبوون لە بەین خۆیانا دەردەدڵ و ڕازونیازی خۆیان بۆ یەك هەڵئەڕشت و ئەگێڕایەوە. یەکێکیان بەوی‌کەیانی ئەوت: ئەرێ توخوا کچێ بۆ مێرد ناکەی بە عەمەدی وەتمانێ؟ ئەمیش وتی: «وەڵڵا خوشکێ ئەگەر عەمەدی وەتمانێ تۆزێ لاوچاکتر و نەختێ دەوڵەمەندتر و چکێ پۆشتەتر و پێچێ وەجاخ‌زادەتر بوایە، مێردم پێ‌دەکرد؛ بە لانی کەمەوە دەگەڵ ئەوەش کە ئەمانەی نییە هەر داواشی بکردمایە شووم پێ‌دەکرد، بەڵام ناشوکری نەبێ لە عاستی من بوویتە دیواری قایمێ، چ قسان ناکا؟».

٥. ساڵێك لە ئەستەمۆڵ ئەوا «عەبدولحەمید» زۆر نییە نیشتۆتە سەر تەختەوە، هەمهەمەیەکی گەورە ڕووی دا. هەرچی شاری ئەستەمبۆڵ بوو هەمووی هەستابوو، کۆڵان و جادە نەیئەکێشا. ڕوویان کردە بارەگای شاهی و کۆشکی «یولْدز». یەکێك لە پێشەوە بانگی ئەکرد: ئەتانەوێ؟ ئەو حەشاماتە هەموو بە جارێ ئەیانوت: نامانەوێ.

لەم هەرا و زەنایە کۆشکی پادشاهی و وەزیر و پیاوە گەورەکان هەموو شڵەژان. «صَدر اَعظَم» پێشیان کەوت و بە هەرجۆر بوو خۆیان گەیاندە کۆشکی یوڵدز. وەزیری جەنگ فەرمانی دەرکرد کە هێزی سەرباز کۆشکی یوڵدز و دەوروبەری بارەگای عەبدولحەمید بتەنێ. وا هەمهەمەش هەتا دێت ئەستوورتر ئەبێ. ڕووەو بارەگای عەبدولحەمید ئەڕۆن و لەسەریەك لەسەریەك ئەڵێن: «نامانەوێ».

دیارە ئەم هەمهەمەیە گەورەیە و ئەم نامانەوێیە هەر ئەوەیە کە یەعنی

عەبدولحەمیدمان ناوێ، بەڵام هێشتا بە تەواویش هەر دەرنەکەتووە کە ئایا عەبدولحەمیدیان ناوێ یا سەدری ئەعزەمیان ناوێ. ئەوەندە دەرکەوتووە ئەم هەمهەمەیە لە دژی میری و کۆشکی یولْدزە.

کابرایەکی «باوەکۆچەك»ـی هەر لە پێش عەبدولحەمیدەوە بە ژیانی پیری لەو تەمەنە پان و درێژەیدا هیچ فێر نەبووبوو تەنها عەرەق خواردنەوە نەبێ؛ هەرچییەکی پەیدا ئەکرد ئەیدا بە عەرەق و ئەیخواردەوە و هیچی‌تر. ئەم کابرایەش وەکوو گای پیر هەر هاواری ئەکرد: نامانەوێ.

دیمەنی ئەم کابرا پیرە بەم جۆرە بە تەواوی ترسێکی خستە بەر سەدری‌ئەعزەم و وەزیرەکانی کۆشکی یولْدز؛ چونکە ئەمە ئەوەی ئەگەیاند کە بە یەکجار میللەت بە گەنج و پیرەوە جووڵانەوەیەکی شۆڕشبیان کەوتۆتە سەر و ئەیانەوێ تەختی عەبدولحەمید تێك دەن. سەدری‌ئەعزەم ویستی قسەیەك لەگەڵ ئەم کابرایەدا بکا بەو ناوەوە کە پیرە و دنیای زۆر دیوە، لەوانەیە ئەم کابرایە بتوانێ بە پەند و قسەی ئاقڵانە بڵاوە بە هەمهەمەکە بکا. بە هەرجۆر بوو ناردی کابرایان هێنا و کابراش لەوان بە جۆشتر هەر ئەڵێ: نامانەوێ. لە ئەنجاما سەدری‌ئەعزەم وتی: «ئاخر کێتان ناوێ؟» کابرا وتی: «ئەو عەرەق‌فرۆشە باوەحیزە کە دووکانەکەی نزیکی منە نامانەوێ. عەرەقەکەی هیچ بەکەڵك نایە».

پاشان سەدری‌ئەعزەم بە وەزیری جەنگی وت: فەرمان دەرکە سەرباز بچنەوە شوێنی خۆیان؛ هیچ نییە، ئەمانە هەر یەکە لە ئاوازێ لێ ئەدەن. تەنها «نامانەوێ»یەکی پێ گرتوون، هەرکەسە بە نیازی خۆی ئەو شتەی خۆی ئەیزانێ ئەوەی ناوێ.

٦. لەو وڵاتی هەولێرە شەخسێك هەیە «هۆمەرمەندان»ـی پێ ئەڵێن، نەخۆشی و شتە ئەبەنە سەری و چاك ئەبێتەوە.

کچێك پیرە دایکێکی هەبوو زۆر نەخۆش بوو؛ کچەش فرە حەزی لە مێرد ئەکرد بە دایکەی وت: دایە با بتبەمە سەر هۆمەرمەندان بەڵکوو نەخۆشییەکەت چاك ئەبێتەوە. دایکیشی وتی: ڕۆڵە نەخۆشی من پیرییە؛ پیری چاکبوونەوەی نییە. کچە وتی: دایە تۆ ئەڵێی چی؟ هۆمەرمەندان هەموو نەخۆشییەك چاك ئەکاتەوە.

بە هەرجۆر بوو دایکی هەڵخڕان و بردی بۆ سەر هۆمەرمەندان. بردی لەناو مەرقەدەکەدا پاڵی خست و خۆی بە دەور مەرقەدەکەدا دەستی کرد بە سووڕانەوە و ئەیوت: «یا هۆمەرمەندان! دایکە پیرێکی بێکەسی بێدەرەتانم هەیە، زاوایەکی چاکی وەجاخزادەی بۆ بنێری با خزمەتی بکا».

دایکە گوێی لە پاڕانەوەکەی ئەم بوو، وتی: هەی وا وا لێکراو، تۆ خۆت مێردت ئەوێ و منت کردووە بە بەهانە، یاڵڵا هەڵمگرە با بچینەوە.

**٧.** حەسەن بەگی عەلی بەگی جاف بۆی گێڕامەوە وتی: سەید مەحموودی کوڕەزای مەولەوی بۆی گێڕامەوە وتی: پیاوێکی «تاوەگۆز»ی لای ئێمە کە ناوی حەمەمراد بوو بە کاروان ڕێی ئەکەوێتە هەڵەبجە؛ ئەمە یەکەم جارە کە ڕێی ئەکەوێتە شارەوە. بە بەر دووکانی سەرتاشێکا تێئەپەڕێ ئەزانێ لەم شوێنەدا سەر ئەتاشن. ئەڵێ: وەڵڵا سەر و ڕیشم هاتووە با بچم یەکجار لێرە بیتاشم و ئەو وەختە بچمەوە.

ئەچێتە دووکانەکە، کابرای سەرتاش لەسەر «ئەسکەملی» دایئەنێ، خاولی ئەخاتە بەر بەرۆکیا و سەر و ڕیشێکی پوختی ئەتاشێ؛ پاشان خاولی ڕائەوەشێنێ و ئەڵێ: موبارەك بێ و حەمەمرادیش هەڵئەستێ و ئەڵێ: «خوا سواوت بنووسێ» و ملی ڕێ ئەگرێ و دێتە دەرەوە. کابرای سەرتاش ئەڵێ: بۆ کوێ؟ بێنە پارەی سەر تاشینەکە. ئەڵێ: پارەی چی؟ ئەی من نەموت خوا سواوت بنووسێ. کابرا ئەڵێ: خوا سواوت بنووسێی

چـی؟ بێنـە پارەی سەرتاشینەکە. لەم قسـەیەك و لەو قسـەیەك ئەبێ بە شەڕیان و تێر لە یەك هەڵئەدەن.

سەی مەحموو وتی: حەمەمرا لە پاشا خۆی ئەم کارەساتەی گێڕایەوە وتی: وتم حەمەمرا ڕاست ڕاست کامتان سەر کەوتن؟ وتی: وەڵڵا سەی مەحموو ئەو لە شـەق تێهەڵدانا لە سـەرەوە بوو، بەڵام من لە لێدان و شەپازللەدا هەر فرەفرە لە سەرەوە بووم.



### قسەی من لەسەر ئەمەیە:

ڕاسـتە لـەو لادێیانـەی کوردەواریـدا یەکێك کافرمانێك ئەگـرێ بـە دەستەوە هەرکەسە دێت خـۆی سـەری ئەخووسێنێ و ئەویـش سـەری ئەتاشـێ، پاشان ئەم کە هەڵئەستێ ئەڵێ: خوا سواوت بنووسێ. ئیتر پارە و مارە لە ناوا نییە. دیسـان شـاریش لە شـەقا لە پێشـن، لادێیی نازانێ شەق بوەشێنێ شەق هەر لەناو ئەوانا باو نییە.

٨. ژنێکـی گەلاڵـی ژان ئەیگرێـت و منداڵەکـەی لـێ نەئەبـووەوە. مێردەکـەی ئەچـوو بـە دەوریا هەڵئەقونـی و هـەر ئەیـوت: قورعانەکەی "بەوراغا" تەقەڵی ڕانی شل بکەی. (بەوراغا ئاغای گەلاڵی بوو)

٩. کابرایەکی «تەڕەدەونی» ژنێکی هەبوو نەخۆش کەوتبوو. ڕۆژێك لە مزگەوت لێی ئەپرسـن: خاڵە حەمەسـەن ژنەکەت چۆنە؟ ئەویـش ئەڵێ: نەخۆشییەکەی گرانە، ئەمرێت. ئەڵێن: چۆن؟ قسەی وا بۆچ ئەکەی؟ چۆن ئەزانی ئەمرێ؟ ئەڵێ: «کورە جاران بۆ توێکڵە شووتی گانی ئەدا، ئێستە ناوەکەیم بۆ داناوە نایخوا؛ ئیتر چۆن نامرێ؟!».

١٠. شێخ قادری موهاجیر لە سولەیمانی لە وەختی خۆیا عەبدولحەمید لە ئەستەمۆڵ ئەنێرێ بەشوێنیا چەند جارێك هەر ناچێ. لە پاشا خەڵکی پێی ئەڵێن: بۆچ ناچیت؟ تۆ کە چوویتە ئەوێ ئەچیتە مابەین شوێنی ئەو پیاوە گەورانە کە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە ئەچن لەوێ میوان ئەبن. ئەویش ئەڵێ: «کورە ناچم گوو بەم بەینچی و گوو بەو بەینچی».



## لە داستانی مەلا حەمەمین

١١. پیاوێك هەبوو لە سولەیمانی مەلا حەمەمینە شێتەیان پێ ئەوت. ڕۆژێك شێخ قادری حەفید لە گوندی «تەنگیسەر» پێی ئەڵێ: مەلا حەمەمین ئەچین بۆ ڕاو وەرە لەگەڵمانا. مەلا حەمەمینیش ئەڵێ: باشە.

قسە دێ قسە ئەبڕێ، ئەم مەلا حەمەمینە زۆر جنێو فرۆش بوو، شێخ قادریش خۆشی ئەویست زیاتر لەبەر جنێوەکانی.

لبادێك ئەخەنە سەر ماینێك و مەلا حەمەمینی سوار ئەکەن. مەلاحەمەمینیش سواری نازانێ ئەکەونە ئەو دەشتە و کەروێشکێك هەڵئەستێنن. ڕاوچییەکان بە سواری و بە چوارناڵە ئەکەونە سەر کەروێشك. ماینەکەی مەلاحەمەمینیش کە ئەبینێ وڵاغەکانی تر کەوتنە غار، ئەمیش ئەکەوێتە لۆقە بەشوێنیانا. مەلا حەمەمین نازانێ جڵەوەکەی توند کا و بیگێڕێتەوە، باوەش ئەکا بە ملی ماینەکەدا و دەست ئەکات بە هاوار کردن. ئەڵێ: کورە بێن بمگرنەوە کەوتمە خوارەوە. شێخ قادر ئەڵێ: گوێی مەدەنێ.

مەلا حەمەمین لەبەر ئەوە کە باوەشی کردووە بە ملی ماینەکەدا و کەوتووە بە سەر زکدا دەعبای ئەکەوێتە جووڵەجووڵ و لەو وەختە ناهەموارەدا کە ئەخشێ لە لبادەکەدا ڕاست ئەبێتەوە. لە لایەکەوە پێی خۆشە و لە لایەکەوە ترسی هاتنە خوارەوەی هەیە. بەڵام توند خۆی ئەگرێ و ئەمجا بانگ ئەکا کورە شێخ قادری وا وا لێکراو مەڕۆ، «ئیرتیفاعی ئالەتم بووە».

شێخ قادر هەر ئەڵێ: بڕۆن گوێی مەدەنێ. بە نەرمەغار بڕۆن. کەروێشکیان لەبیر ئەچێتەوە و ئەپلکێن بە بەزمی مەلا حەمەمینەوە. زۆری پێ ناچێ مەلا حەمەمین بانگ ئەکا و ئەڵێ: «**"لا حَولَ و لا قُوَّةَ إلّا بِاللّه، أشهَدُ أن لا إلهَ إلّا اللّه و أشهَدُ أنَّ مُحَمّداً رَسولُ اللّه"** شێخ قادری ناموبارەك ئینزالم بووەوە».

١٢. هەر ئەم مەلا حەمەمینە مەلای تەنگیسەر ئەبێ کچێکی یەك‌ساڵانی ئەبێ. ڕۆژێك شێخ قادر ئەچێ کچەکەی ئەگرێ بە باوەشەوە و ماچی ئەکاتەوە پاشان ئەڵێ: «ئای ئای مەلا حەمەمین خۆ کچەکەت قوزی کردووە». مەلا حەمەمینیش ئەڵێ: «توخوا ئەوە بەڕاستە شێخ قادر؟» دەسا بەو قورعانەی خەتمم کردووە تا ئێستە نەمزانیوە؟.

١٣. مەلا مەحموودی حاجی عەلی هەبوو لە سولەیمانی. ئەم مەلا مەحموودە لەگەڵ «خافاتم» ناوێکا لە سەردەمی گەنجیدا دڵیان پێکەوە بوو، زەمان بۆی ڕێ نەخستن ببن بە هاوسەر. مەلا مەحموود ژنی هێنا و خافاتمیش شووی کرد. دەوری گەنجی بەسەر چوو، لە سەردەمی پیریدا مەلا مەحموود ژنەکەی مرد و خافاتمیش مێردەکەی مرد. چارەنووس لەو سەردەمی ئیختیارییەدا کردنی بە هاوسەر. جا هەموو دەم کە مەلا

مەحموود لەگەڵ خافاتما ئەکەوتنە گەمەوگاڵتە ئەیوت: «ئای خافاتم ئەوەڵ شام و ئاخر شام!».

١٤. محەمەدعەلی کوردی کتێبی چیرۆکی «زادیچ»ـی لە چاپ دابوو. یەکی بە دووسەد فلس بوو. (٣٥٠) دانەی لە بەغدا لەلای وەستا بەشیر موشیر دانابوو، لە پاش ماوەیەکی زۆر چووە لای وتی: با حسابێکی کتێبەکان بکەین. وەستا بەشیر وتی: چەند بوون؟

محەمەدعەلی وتی: (٣٥٠) دانە. وتی: ئەی مردووت مرێ! کەی ئەوندە بوو؟ وتی: ئەی چەند بوو؟ [وتی:] (٢٥٠). وتی: باشە با ئەوەندە بێ، با حساب بکەین کوا کتێبەکان؟ وتی: چووزانم هەندێکیان لێ فرۆشراوە. وتی: ئەوەی فرۆشراوە حەقی فرۆشتنەکەی هەڵبگرە و ئەوی‌ترم بدەرێ. وتی: سەدی لێ فرۆشراوە و سەدوپەنجاکەی‌تریشی نازانم چی لێ هاتووە؟ وتی: باشە ئەو سەدە کە فرۆشراوە پارەی ئەوەم بدەرێ. وتی: سەدی دەی هی خۆمە. وتی: باشە ئەوی‌ترم بدەرێ. وەستا بەشیر تۆزێ ڕاما و لە پاشا وتی: «تۆ لات وایە ئەم دووکانە بە تڕ ڕاگیراوە ئەوی‌تریشی بۆ دووکانەکە!».

١٥. پیاوێك هەبوو لە سولەیمانی «سەی عەلی "بِسمِ اللّٰه"»یان پێ ئەوت. بە «بِسمِ اللّٰهِ الرّحمنِ الرّحيم» توورە ئەبوو. پێیان ئەوت: خاڵە سەید قورعان پڕیەتی لە «بسم اللّٰه» تۆ بۆچ پێت ناخۆش نییە؟ بەتایبەتی هەموو ڕۆژێ خۆت لە نوێژا چەند جار ئەیخوێنی. ئەیوت: «باوکم، ئەم بیسمیلایانە ئەو بیسمیلایە نییە کە هەیە. من بیسمیللای خۆم ئەناسم، باریکە و درێژ».

١٦. جا ئەم سەی عەلییە جارێك قادراغا هەبوو پیاوێکی کەڵەگەتی زەلام، سەی عەلیش بچکۆلەیەکی ڕیویلە بوو. لەسەر جادەکەی «کانیسکان» هەر لەسەر "بسم اللّٰه" ئەبێ بە شەڕیان. قادرئاغا ئەیگرێ و ئەینێتە ژێرەوە بە لەقە دێت بە ویزەیا. سەی عەلیش لە ژێرەوە هاواری ئەکرد و بانگی ئەکرد: «ئەرێ ئەوە گەوادێك و سەگبابێك و قەحبەبابێك نییە بێت لێکمان بکاتەوە؟!».

١٧. جارێك سەی‌عەلی بیسمیللا لە سولەیمانی ژن دێنێت. شێخ لەتیفی شێخ مەحموو ـ کە سەی‌عەلی خزمیشی بوو ـ بۆی دەستەبەر ئەبێ کە تەدارەکی ئەم شایی و ئاهەنگەی بۆ بکا.

شێخ لەتیف بێت و ئاهەنگی شایی بۆ سەی‌عەلی خزمی ڕێك بخا، ئەبێ چۆن بێ؟ خانوویەکی باشی بۆ ڕێك ئەخا بە تایبەتی ئەو ژوورەی کە شەوێ زاوا و بووك ئەچنە ناوی؛ هەمووی ئاوێنەبەند ئەکا و سەی‌عەلی ئەبا بۆ سەیرکردنی. سەی‌عەلیش زۆری پێ‌خۆش ئەبێ. پاش بانگی شێوان کە ئیتر سەی‌عەلی ناچێتە ئەوێ مەگەر کاتێ نەبێ کە بووك بچێتە ئەوێ و بچێتە لای بووك.

شێخ لەتیف ئەچێ دە دوانزە «بسم اللّٰه الرّحمن الرّحیم» لەسەر پارچە کاغەزی گەورە و مقەبا ئەنووسێ و ئەیباتە ژوورەکە بە هەموو لایەکی ژوورەکەدا دایانئەکوتێ؛ تەنانەت بە بن میچەکەشا؛ [گڵۆپ] ئەکێشن و سویچەکەی لە دەرەوە ئەشارنەوە، ژوورەکەش پەنجەرەی تیا ئەبێ و بەرهەیوانی لە بەرا ئەبێ.

شەوێ درەنگ، وەختێك بووك ئەبرێتە ژوورەوە؛ پاش ماوەیەك سەی‌عەلیش ئەکەنە ژوورەوە. لە ژوورەکەدا تەنها چرایەکی بچکۆلە ئەبێت، شێخ لەتیف و چەند کەسێك لە هاوڕێکانی خۆیان لە دەرەوە

شاردۆتەوە. سەیعەلی لە ژوورەوە وردەوردە ئەکەوێتە خۆی و لەو کاتەدا کە ئەیەوێ خۆی ڕووت کاتەوە ئەمان لەم دیوەوە جارێ دەرگاکەی لێ دائەخەن. ئەمجا شێخ لەتیف دەست بە دوگمەی سویچەکەدا ئەنێ، هەموو گلۆپەکان لە ژوورەوە هەڵئەبن. سەیعەلی لەم شتە ناکاوییە ئەحەپەسێ، پەلاماری دەرگا ئەدا دەرگا داخراوە، سەیری دار و دیوار ئەکا هەمووی «بسم الله الرّحمن الرّحیم»ـە، بە تەواوی شێت ئەبێ و نازانێ چی بکا؟ ئەوانیش لە دەرەوە دەست ئەکەن بە چەپڵەڕێزان و بە یەك دەنگ بەدەم چەپڵەوە ئەڵێن:

هـەی زاوا زاوا زاوە دەستی بگرە و بە دواوە

سەیعەلی دەست ئەکا بە جنێودان و بە کفر کردن. حەیتە ئەنیشێتەوە وەکوو پشیلەیە خرابێتە ژوورێکەوە و دەرگای لێ داخرابێ، چۆن سەری لێ تێك ئەچێ و ئەشڵەژێ، ئەمیش وای لێ دێ. سەیری دار و دیوار ئەکا هەمووی بیسمیللایە. لە شووشەی پەنجەرەوە سەیری بەر هەیوان ئەکا قیامەت و چەپڵەڕێزانە. ئەوەندە خۆی ئەدا بە دەرگا و پەنجەرەدا و ئەوەندە جنێو ئەدا هەتا بە تەواوی پەکی ئەکەوێ و لەو ناوەدا ئەکەوێ.

پاشان دەرگاکەی لێ ئەکەنەوە و یەکەوجار پەلاماری شێخ لەتیف ئەدا؛ شێخ لەتیف هەڵدێت. بەو جۆرە بەو داخەوە ئەتلێتەوە تا بەیانی، ئەچێ بۆلای شێخ مەحموود بۆ شکات کردن و هەزار جنێو بە شێخ لەتیف ئەدا.

شێخ لەتیفیش ئاگای لێیە، بەڵام خۆی بەرچاو ناخا. شێخ مەحمووديش نازانێ پێ بکەنێ یا دڵنەوایی سەیعەلی بکا. ئەمجا لەبەر ئەو ئەفەرمووێ: ئا لەتیفم بۆ بانگ کەن. شێخ لەتیف دێنن و دەست ئەکا بە قسە وتن و پێی ئەڵێ: هەی ناجسن چۆن دڵی خاڵە سەیعەلی عاجز ئەکەی؟ دە

هەستە دەست بکەرە ملی و ئاشتی بکەرەوە. شێخ لەتیفیش بە «خاڵە سەی عەلی گیان» پەلاماری ئەدا و سەی عەلی خۆی ڕائەپسکێنێ. بەڵام ئەم جۆشی داوە تونگە باوەشی پیا کردووە و ئەیگوشێ لەوانەیە هەموو پەراسووەکانی ورد بکا.

سەی عەلی تووڕەیی زەماوەنی لە تاو ژانی پەراسووی لە بیر ئەچێتەوە ئەڵێ: ناجسن بەرەڵام کە پەراسووم شکا. شێخ لەتیف ئەڵێ: بە سەری ئەو شێخە تا ئاشت نەبیتەوە لەگەڵما بەرەڵات ناکەم. سەی عەلیش لە ترسی شکانی پەراسووی ئەڵێ: ئاشت ئەبمەوە گوو بە چارەی ئەو کەسە لەگەڵ ئێوەدا قسە ئەکا. ئەمجا بەرەڵای ئەکا و زیافەتیکێشی بۆ شیرینی خواردنی ئاشت بوونەوە بۆ ئەکا. شەوی دوایی بەڕاستی ئەیکەنە پەردەوە.

١٨. مەلا مەحەمەدی دەربەندیخان چووبوو بۆ حەج. کە هاتبووەوە قسەی حەجی بۆ مەحموبەگی جاف ئەگێڕایەوە کە چۆن تەوافی کردووە و چۆن بە سۆز و عەزیەتێکی زۆر ڕەجمی شەیتانی کردووە. کە ئەگاتە سەر شەیتان مەحمووبەگ ئەڵێ: خوا بتگرێ گوایە دڵت خۆشە تۆ ئیشێکی چاکت کردووە؟ خواوەنتەعالا لە قورعانا لە پەنجا لاوە بەرینگاری شەیتان بووە، ئیتر نازانم چاری کردووە یا نەیکردووە، ئێستە تۆ بۆچ ئەم دوژمنە گەورەیەت بۆ خۆت دروست کرد؟ بەدبەخت، ئاخر تۆ منداڵداریت!.
مەلا محەمەد ئەڵێ: «کەواتە نەڕەجم نەڕەجم».

١٩. عەلیڕەسوولی ڕوغزایی هەبوو پیاوی ڕەزابەگی جاف بوو. ئەم عەلی ڕەسوولە ڕۆژێك لەسەر حەوزەکەی کەلار دەستنوێژی ئەشۆرد، لەو کاتەدا کە قاچی ئەشوا ترێك ئەکەنێ. چاری نەما وتی: «جا وەرە پیاوەتی بۆ خوا بکە!».

٤٠. لە ئاوایی «بەیانلوو» شایی ئەبێ، دەنگی گەلێ لا ئەکەن. زورناژەن و دەهۆڵکوتی ئەو ناوەش ئەڕۆن. خۆت ئەیزانی لە کاتی هەڵپەڕکێدا کابرای زورناژەن لە کاتێکا کە یەکێ شاباش ئەکا لمۆزی بۆ بەرز ئەکاتەوە و دەمی زورناکەی ئەکاتە ئاسمان و بۆی ئەقووقێنێ، دەهۆڵدەرەکەش ئەوەندەی‌تر گەرمی ئەکا. ئەو لای بەیانلووە و وڵاتی نزیکی «فورقانە»ش شێوە قسە کردنێکی جیاوازیان هەیە لەوانی‌تر. زورناژەنێکی ئەو وڵاتی «گێژە» ئەچێ بەدەم شاییەوە ئەوا هەڵپەرکێش گەرمە.

سەمینی ئەمین هەبوو خەڵکی فورقان بوو ئەویش ئەچێ بۆ بەیانلوو بۆ ناو شایی و هەڵپەڕکێ. کیژانی کڵاو لار کڵاو لار هەڵئەپەڕن. سەمینیش دەست ئەگرێ، دەهۆڵ و زورنا دێتە بەردەمی، کابرای زورناژەن دەمی زورناکەی ئەکاتە ئاسمان، سەمین نیو ڕووپیە دەردێنێ و ئەیدا بە دەهۆڵکوتەکە کە بیکا بە شاباش. ئەڵێ: «بووشم هی کێیە؟» سەمین ئەڵێ: «بێژە سەمینی ئەمینی میرەی محەمەد خانزەی ڕۆژبەیانی فورقانی ماڵیان ها لە بان خانیەفورقان».

کابرای چاوەش ئەڵێ: «بگرە باوە سەگ! کوتە ڕووپیەکەت، ئەی پیچوپلووچە وە من نیەوترێت».

٤١. مامۆستا مەلا کەریمی بیارە لە بابەڕەسوولی دۆڵاشی ئەگێڕایەوە وتی: «ئەولێ» و «ئەولەسەن» هەبوون لە «سنە»، برا بوون. خوشکێکیان هەبوو «سانیەخانم»ـی ناو بوو. ئەمانە کوڕ و کچی ئاحەمەمرا بوون. ئەم ئاحەمەمرادە زاوتی ماڵی ئاسەف دیوان بوو. ئا حەمەمراد عەمری خوای کردبوو. ئەولێ کە براٰ گەورە بوو هەموو ماڵەکەی داگیر کردبوو

بەشی ئەولەسەن و سانیەخانمی نەئەدا. گەلێ دەمەقرە لە ناویانا پەیدا بووبوو، هیچ کەڵکی نەبوو. لە ئەنجاما ڕۆژێ ئەولەسەن بە سانیەخانم ئەڵێ: «ئاباجی بێژە بە ئابرام، مەرحوومی باوکم پووڵ و ماڵێکی بۆ بەجێ هێشتگین؛ سەر بێرێتە سەر ڕاسی حەساومان چەس پێمان دا ئەگەرنە تفەنگەکەی خوا بیامورزی باوکم تێرم خۆراکێ باررووتی تێ ئەکەم، پۆخێ پەمگیچ ئەخەمە ناوی، تەرەقەکەیچ ئەنینە بان مەمکەکەی ئەیتەقێنین. سا ئیتر چی ئەوێ با بوێ زاڵەدار زاڵە ئەترەکێنێ «فی‌النّار» حاملە حەمڵ ئەخا، بە توون و تەوەس».

٢٢. ساڵی (١٩٥٩) چەبیرەی مامۆستا کوردەکان بوو لە «شەقڵاوە». هەرچی مامۆستای کورد هەبوو لەوێ کۆ ببوونەوە قسەیان لە کاروباری خوێندنی زمانی کوردییەوە ئەکرد لە قوتابخانەکانا. شەقڵاوە هاوینەهەوارە زۆر کەس ڕووی تێ ئەکرد. حەمەڕەشیدبەگی کۆکز لەگەڵ شێخ عومەری دەکە بە ناوی ڕابواردن لە هاوینەهەواردا، ئەوانیش چووبوون بۆ ئەوێ. جێگا دەست نەئەکەوت.

«مام ڕەسوو کاکۆ» هەبوو چاخەنەیەکی هەبوو لە دۆڵەکەدا هەم چاخانەبوو هەم نوێنیشی هەبوو خەڵك لێی ئەنوستن. حەمەڕەشیدبەگ و ئەوان ئەچنە ئەوێ. مام ڕەسوویش پیاوێك بوو وەزیرێك و گزیرێکی بەلاوە وەکوو یەك وا بوو، کێ پارەی چای بە پوختی بدابوایە ئەوەی بەلاوە لە هەموو کەس پیاوتر بوو، لە هەمان کاتا وەکوو ساویلکە بوو، تووڕەش بوو.

حەمەڕەشیدبەگ سەری خستە سەری بەلام پارە چایشی ئەدایە. پێی وت: مام ڕەسوو من بەگزادەی جافم گوندەکانم هەموو لەم سەردەمەدا بە

چەپڵە داگیریان کردووە و لە دەستیان سەندووم. مام ڕەسوویش ئەڵێ: جا ئێستە ئەتەوێ چ بکەی؟ ئەویش ئەڵێ: وەڵڵا هەر لە هاتوچۆدام بۆ ئەوە وەریان بگرمەوە. ئەویش ئەڵێ: کوو وەریان دەگریتەوە؟ ئەمە سەردەمی جومهووریە. ئەویش ئەڵێ: دەسا هەزار جومهووری بێ هەر ئەبێ وەریان بگرمەوە. وەریان ئەگرمەوە لە داخی جومهووری و بە کوێرایی چاوی تۆ. مام ڕەسوو ئیتر تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: «هەروەها دە هەڕۆ هەر لۆ خۆت غارغارێنێ بکە و بزانم چت پێ دەکرێ؟».

٢٣. عومەر قەزاز هەبوو لە سولەیمانی لە کاتی خۆیا فرە شۆخوشەنگ و لاوچاك بوو، دەوری گەنجایەتی گۆڕییەوە بە دەوری پیری. کوێستانی سەر و ڕیشی لە خاڵخاڵی دەرچووبوو، بوو بە کلۆری بەفر.

ئەم عومەر قەزازە جارێك ئەچێتە بەغدا. کە لە سولەیمانی دەرئەچێ سەری سپی ئەبێ کە ئەگەرێتەوە ئەو مووە سپیانە ڕەش ئەبنەوە،؛ تومەس ئەمە باوە لە بەغدا مووی سەر بۆیە ئەکەن، ئەویش وای کردووە. کوڕوکاڵ ڕۆژێ دائەنیشن و بڵاوی ئەکەنەوە کە عومەر قەزاز سەری قیرتاو کردووە. ئەویش لە ئەنجاما ئەڵێ: «باوکم ئێوە دەخڵتان چییە؟ من سەری خۆمە و گووی تێ ئەکەم».

٢٤. مەلا ڕەئووف بۆی گێڕامەوە وتی: ئەحمەدی حاجی فەتاح لە سولەیمانی لە ماڵی خۆیا نازداری باوك و تاقانەی دایك بوو. کەوای شیرداخ و سەڵتەی ماوەت و چەفتە و مشکی، ئەمانە هەمووی هەر لەو ئەوەشایەوە. لە «سەفەربەلك»دا برا بۆ عەسکەری. لە شەڕێکا گوللەیەکی بەر ئەکەوێ، ئەبێ بە هۆی تێکچوونی ئەقڵی. کە گەڕایەوە بۆ سولەیمانی لەبەر ئەو تێکچوونی ئەقڵەی ئەو ناز و نیعمەتی پێشووە

هەمووی زەمان پەردەی چەوسانەوەی بە سەرا هێنا و وای لیٚهات بە شەو لە خانەقای حاجی مەلا عەلی ڕۆژی ئەکردەوە.

مەلا سالحی مەلا زوبەیر لەویٚ بوو. ڕۆژیٚك لەسەر شۆربا لەگەڵ مەلا سالح تیٚك ئەچن و دەری ئەکا و پیٚی ئەڵیٚ: بۆچ گەرت بەم خانەقایە پیٚچاوە و بچۆرە شوێنیٚکی‌تر. ئەحمەدئاغاش پیٚی ئەڵیٚ: «برۆ مردووت مریٚ، سەرت ئەڵیٚی سەری قومقومۆکە، «تابوورئاغاسی»یەکی وەکوو من نەبیٚ کیٚ لەم سواڵکەر تیا تۆپیوخانەدا ڕۆژ ئەکاتەوە؟»

٢٥. ئەحەی نازیٚ هەبوو لە سولەیمانی مامەڵەی لەگەڵ ئەو شارەزوورەدا هەبوو. یەکیٚ لەو کەسانە کە ئەم شتی ئەدانیٚ «مارف» ناویٚك بوو خەڵکی ئاوایی «مستەفا». شکاتی لیٚ کردبوو، هێنابووی بۆ سولەیمانی و بردبووی بۆ مەحکەمە. حاکم لە ئەحە ئەپرسیٚ: دەعوات چییە لەم کابرایە؟ ئەڵیٚ: قوربان پەنجا ڕووپیەم لایەتی. ئەڵیٚ: تۆ ئەڵیٚی چی کابرا؟ ئەڵیٚ: قوربان درۆ دەکا و وەو سەی‌ساقە هیچی لام نییە.

ئەڵیٚ: ئەحە تۆ سەنەدت هەیە؟ ئەڵیٚ: «نەوەڵڵا». ئەڵیٚ: کەواتە ئەتوانی سوێندی بدەی. ئەحە ئەڵیٚ: «قوربان سوێندی چی؟ ئەم کابرایە نە نوێژ ئەکا نە هیچ، لە کویٚ ئیمانی بە سوێن هەیە؟» هەر خێرا مارف هەڵئەداتیٚ دەستی بەرز ئەکاتەوە و ئەڵیٚ: «ترحێو حاکم کیٚ نوێژ ناکا».

٢٦. دیٚی «کەوڵە» هەبوو لە وڵاتی دیواندەرە، دیٚی «موشیردیوان»ی سنە بوو؛ لیٚی یاخی بوو هیچیان نەئەدایە. ئا حەمەعەلی هەبوو زاوتی موشیردیوان بوو، پیاویٚکی تا ئەندازەیەك بە زەبروزەنگ بوو. بە موشیردیوانی وت: کە ئەو بنێریٚ کەوڵەی وەکوو ماسی مەییو بۆ لیٚ بکا. موشیردیوانیش ناردی، بەڵام کە ئەچێتە ئەویٚ کەوڵەیی چەتوون

بوون گوێیان بەویش هەر نەداوە، بەڵکوو لە دێیەکەش هەر دەریانکرد.
ئا حەمەعەلیش کەوتۆتە تەقە و نازانێ چ بکا، لە ڕوویشی هەڵنایێ بەو جۆرە بگەڕێتەوە بۆلای موشیردیوان؛ چونکە ئەو بە هەڕ و گیفێکیترەوە هاتووە. ماوەیەکی باشی پێ ئەچێ و لە ئەنجاما ئەنووسێ بۆ موشیردیوان ئەڵێ: «سەروەرم تاجی سەرم ئاغای موشیری شارگەلم، کەوڵەم دامرکانگەسەوە، وەلێ جێگا نییە تیا دانیشم. غوڵامت ئا حەمەعەلی».

**٢٧.** سەردەمێك لەو وڵاتی گەرمیانە کورد و کارە ئەچوون بۆ دزی. خاوەن ماڵ، دزەکانی ئەناسی و ئەچوو شکاتی لێ ئەکردن، یا لەلای شەرع یا لەلای حاکم شەرع دزی ڕائەکێشایە مەیدان و سوێندی ئەدان. ئەوانیش سوێندیان نەئەخوارد و ماڵەکەیان ئەدایە دواوە، ئەو عەزیەتەیان بە هیچ دەرئەچوو.

«مەلا تەقی» هەبوو لەو دەشتی گەرمیانە پەنایان ئەبردە بەر ئەو چارێکیان بکا بۆ ئەوە ئەگەر جارێکیتر کە دزییان کرد بتوانن بیخۆن.

ئەمجا مەلا تەقی ئەیهێنا کابرای لە پاش دزیکردنەکە ئەخستە بێشکەیەکەوە و بە دەسترازە شەتەکی ئەدا و تۆزێ ڕایئەژەند و پاشان ئەیکردەوە و ئەیوت: لە بێشکەکە وەرە دەرەوە. فێری ئەکرد ئەیوت: کە بردتیان بۆلای قازی سوێند بخۆ بڵێ: لەو ڕۆژەوە پێم لە بێشکە کەوتۆتە خوارەوە ئیتر نەخراومەتە بێشکە من دزیم نەکردووە.

ئەویش کە ئەیانبرد بۆلای شەرع بەو جۆرە سوێندی ئەخوارد و شەرعیش بەرەڵای ئەکرد، لای وا بوو بێشکەی منالییەتی و ئەمیش سوێندەکەی نەئەکەوت.

هەروەها فێری ئەکرد لە کاتێکا کە ئەیبەن بۆلای حاکم و سوێندی

ئەوەی ئەدەن کە ئەو ماڵەی نەدزیوە، بۆقێ، چۆلەکەیێ، گیاندارێکی وا بخاتە باخەڵیەوە لە ژێر کەوا و کراسەکەیەوە بە جۆرێك کە دیار نەبێ، لە کاتی سوێند خواردنا دەست بدا بە سەر سینگیا ـ ئەوا بۆقەکەش لە ژێر دەستایە ـ بڵێ: بەم قورعانە ئەم نەفسە بێت و ئاگای لەو دزییە نییە. ئەویش وای ئەکرد و بۆ خۆی بەرەڵایان ئەکرد. نەفسەکەش چی بوو بۆقەکە بوو، دیارە ئەو بۆقە ئاگای لەو دزییە نییە.

٢٨. جارێك مانگ گیرا بوو؛ خەڵکی کۆ ببوونەوە لەسەر بانەکان لە تەپڵ و تەنەکەیان لێ ئەدا. کابرایەکی «ڕەشوبۆری» هەبوو فەتەی ناو بوو، بەلای ئاواییەکەدا تێپەڕی. [وتی: ئەو زرموکوتەتان لە چییە؟] وتیان: وەڵڵا ئەوەتا مانگ گیراوە و ئەمانەوێ بەر بێ!. کابرا سەرێکی بەرز کردەوە و سەیرێکی مانگەکەی کرد و وتی: «کوڕە لێگەڕێن ئەو دەویت باوکە ساڵ دوانزە مانگەی خوا جرت و فرتیەتی بەملاوبەولادا، دەمێ وەکوو دەمەداس، دەمێ وەکوو کاسەماس، دەمێ وەکوو قانگڵەی شکیاگ، دەمێ وەکوو دەواری لای بڕیاگ، ئێژی جیکەنەی تێ کریاگە، دیقەدیقەی ئەدا وەو خەڵکە، نەیئەزانی ئاخری ڕۆژێك لە کەلێنێکا وە گیری تێرن. لێگەڕێن با بیخوا، با بزانێ عەلی کوڕی کێیە؟ لای وایە گشت شوێنێ هەوارەپانکەی ماڵی میمکە فاتەمە هەر قولی قولی بکا».

٢٩. کابرایەك هەبوو لەو شارەزوورە پێیان ئەوت «ئافە»؛ ئیشی هەر دزی کردن بوو. شەوێك قیر لە ماڵێکا ئەیگرن ئەیبەن بۆلای مەلا حەسەنی مەلا قادری بیارە کە چێوی حوکمەتی بە دەستەوە بوو. مەلا لێی ئەپرسێ: کابرا تۆ بۆچی چوویتە ئەو ماڵەوە؟ ئەڵێ: «وامزانی ماڵی خۆمانە». ئەڵێ: باشە کە ژنی خاوەن ماڵەکە دەرکەوت بۆچی چوویت

لە پاڵ کەنووەکەدا خۆتت شاردەوە؟ ئەڵێ: «وەڵڵا قوربان وامزانی ژنەکەی خۆمە!».

٣٠. ساڵی (١٩٣٧) بوو «سەی‌عەلی "بسم‌الله"» لە سولەیمانی لەسەر بیسمیللا لەگەڵ حاجی تۆفیقی پیرەمێرددا تێك چووبوو.
پیرەمێرد ڕۆژنامەی «ژین»ی هەر لە سولەیمانی دەردەکرد. مەلا سدیقی نازەنینی حاکمی کوبرا بوو لە سولەیمانی. پیرەمێرد هەر جارەی هەڕەشەی ئەنارد بۆ سەی‌عەلی کە واز بێنێ لە جنێودان ئەگینا خراپی پێ ئەکەم. سەی‌عەلیش ئەیوت چی لە دەست دێ ئەو زەندیقە درێغی نەکات. لە ڕاستیشدا حاجی تۆفیق شەڕی بەو ئەفرۆشت.

پیرەمێرد لەم قسەی سەی‌عەلییە هەلی دەست کەوت، هەستا چوو لە مەحکەمە شکاتی لە سەی‌عەلی کرد کە کافر بووە. جەمیل سائب خوشکەزای حاجی تۆفیق مدیری خەزێنەیە، ئەحمەد موختاری هەولێری قازی سولەیمانییە کاربەدەستانی سەراش هەموویان سەریان لە موحاکەمەیەکی وا ئەخورێ. بە هەموویانەوە قسەیان کرد بە یەك کە موحاکەمەیەکی وەها بۆ ئاهەنگی ڕۆژێکی سولەیمانی پێویستە. ڕۆژی چواری «نیسان»یان دانا بە ڕۆژی موحاکمە، پسووڵە دروست کرا و بەو پسووڵانە بە پیرەمێرد و سەی‌عەلی ڕاگەیێنرا کە ڕۆژی چواری مانگ حازری موحاکەمە بن. حاجی تۆفیق چەند شایەتێکی پێکەوە نا کە سەی‌عەلی کفری کردووە لەگەڵ ئەوەشا ئەمانە هیچی وا نەبوون، سەی‌عەلی هەر ئەوە بوو لەوە تووڕە ئەبوو هەروەخت کە حاجی تۆفیق ناوی ئەهێنا پێی ئەوت: «سەی‌عەلی بیسمیللا» ئیتر حاجی تۆفیق ئەم قەوانەی بۆ دروست کرد.

ڕۆژی یەکی مانگ پیرەمێرد ناردی بە شوێن هەموو دەهۆڵ و زوڕناژەنەکانی سولەیمانیدا کە هەر لە ئێستەوە بە دەهۆڵ و زوڕناکوتان بکەونە ناو شار و بڵێن: ڕۆژی چواری مانگ موحاکەمەی حاجی تۆفیقی پیرەمێرد و سەی عەلی بسمیللایە لە سەرای سولەیمانی. بەم جۆرە دەهۆڵکوت کەوتنە ناو گەڕەکەکانی سولەیمانی ماوەی سێ ڕۆژ ئەمەیان وت، بەڵام پارەیەکی باشیشیان لە حاجی تۆفیق وەرگرت. سەی عەلی جاران تووڕە ئەبوو هەر لەبەر ئەوە بوو کە پیرەمێرد لە بەر خۆیەوە پێی ئەوت بیسمیللا، ئێستە بیسمیللا کەوتە دەم زوڕناژەن و هەموو مناڵی سولەیمانی.

ڕۆژی چواری مانگ ئەهلی دایەرەکان و خەڵکی سولەیمانی هەموو ڕوویان کردبووە بەر دەرکی سەرا. دەرزیت هەڵبخستایە نەئەکەوتە سەر ئەرز. مەحکەمە دانیشت، مەلا سدیق لە سەرەوە قازی لەملایەوە سەی عەلی خرایە قەفەزی تاوانبارانەوە، پۆلیس لەملاولەولایەوە بە تفەنگەوە ڕاوەستان. حاجی تۆفیقی پیرەمێرد بە خۆی و شایەتەکانەوە ڕاوەستاون. سەرۆکی مەحکەمە بە ناوی خاوەن شکۆوە مەحکەمەی ڕەسمی بڵاو کردەوە و ڕووی کردە سەی عەلی: کە ئەو حاجی تۆفیقە داوا ئەکا تۆ کافر بوویت، تۆ ئەڵێی چی؟ [سەی عەلی] ڕەنگ لە ڕوویا نەما و وتی: وا نییە، من موسڵمانم «**أشهدُ أن لا إلهَ إلّا اللهُ و أشهدُ أنّ مُحَمّداً رسولُ اللهِ**». ڕووی کردە حاجی تۆفیق وتی: تۆ چی دەڵێی؟ وتی: «جەنابی سەرۆکی مەحکەمە ئەم سەی عەلی بیسمیللایە بە منی وتووە زەندیق و ئەمانەش شایەتمن. زەندیقیش بۆ موسڵمان ناوترێ؛ لە ئایینی ئیسلاما یەکێك موسڵمانێك بە کافر دەرکا خۆی کافر ئەبێ.

ئەمجا سەرۆك ڕووی کردە قازی و وتی: بیروباوەڕی ئێوە چییە. قازی

وتی: بەڵێ، لە زەمانی ئەمەوییەکانا کە ئەوترا زەندیق یانی کافر وە ئێستەش ئەو تاوانبارە ـ کە لەو قەفەسەدایە ـ شایەتیمانی هێنا، مەعنای وایە لە کفرەکەی خۆی پەشیمان بووەتەوە. ئەمجا ئیتر بیری مەحکەمە چۆنە بەم جۆرە حوکم ئەدا.

ڕووی کردە حاجی تۆفیق وتی: تۆ ئەڵێی چی؟ وتی: جەنابی حاکم ئەم پیاوە بە منی وتووە زەندیق و لێی خۆش نابم. لەگەڵ ئەوەشا پرس و ڕای مەحکەمە چۆنە من لەو پرس و ڕایە دەرناچم.

سەرۆك وتی: ڕای مەحکەمە ئەوەیە کە ئاشت بەرەوە لەگەڵی و ڕێکەونەوە. حاجی تۆفیق وتی: جەنابی سەرۆك من لەم ڕێگایەدا تووشی زیانێکی زۆر بووم، ئەبێ زیانەکەم بۆ ببژێرێ. سەرۆك وتی: مەحکەمە بە ناوی میهرەبانییەوە داوات لێ ئەکا کە ئاشت ببنەوە. حاجی تۆفیق وتی: لەسەر ڕوو لێنانی مەحکەمە من لەگەڵی ئاشت ئەبمەوە و لێی خۆش ئەبم، لەسەر ئەوە کە لە ئێستە بەدواوە هەرچەند وتم: سەی عەلی بیسمیللا، ئەم سەی عەلی بیسمیللایە توورە نەبێ.

سەرۆك ڕووی کردە سەی عەلی وتی: تۆ ئەڵێی چی؟ سەی عەلی ملێکی لار کردەوە و وتی: باشە. هەر کە ئەو وتی باشە. بوو بە چەپڵە و هەرا و سەی عەلی لە قەفەس هاتە دەرەوە و حاجی تۆفیق چوو بەلایەوە دەستی خستە ناو دەستی و ئاشتی بووەوە لەگەڵیا.

ئەمجا پاش ئەو ڕۆژە پیرەمێرد بە دەم وازی نەهێنا، هەموو جار لە ڕۆژنامەکەیا بە نووسین «سەی عەلی بیسمیللا»ی ئەنووسی و سەی عەلیش لە داخا وەختەبوو شەق بەرێ و هیچیشی پێ نەئەوترا. ئەم محاکمە و محاکمەکارییەش هەمووی بۆ گاڵتە بوو، ئەگینا هیچ بناغەیەکی نەبوو.

٣١. مەلا قادرێك هەبوو مەلای هەمزاغای بلّباس بوو، گێڕایەوە وتی: ئەوا گەلێ جار لە نوێژ و قورئان خوێندنا ئایەتی ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ﴾ ئەهاتە پێشەوە و ئەمخوێند. هەمزاغا هەموو جار پێی ئەوتم: مەلا نان و جێگام پێداوی و لەسەر منەوە ئەژیت، کەچی تۆ ناوی «جاف» لە نوێژ و قورئانەکەتا دێنیت. وتی: منیش وتم: ئاغا ئەمە من نایلّێم، قورئان قورئانی خوایە، خۆ من دامنەناوە. ئاغا وتی: مەلا من ئەمە نازانم، ئەبێ ناوی ئێمەش هەبێ لە قورئاندا ئەگینا ئەنجامی باش نابێ.

وتی: بەمجۆرە ماوەیەك لە کێشەوبەرەدا بووین، ئەو هەر ئەیوت و منیش خۆ هیچ. ئەوەندەم زانی شەوێك زەلامێك کردی بە ژوورا و خەنجەرێکی ڕووتی بە دەستەوەیە وتی: هەمزاغا ئەڵێ: یا ئەم خەنجەرە یا ئەبێ ناوی ئێمەش لە نوێژ و قورئانا هەبێت. جاف چ ڕایەی ئەوەیان ئەکەوێ ناویان هەبێ و ئێمەش وەکوو کەندووان لەوێ بکەوین؟ کەچی نان و بەرگی تۆیش لەسەر ئێمەیە.

وتی: ئیتر بە تەواوی من چوومە تاسەوە و تێگەیشتم کە کابرا بە ئاشکرا مرخی لێ خۆش کردووم. وتم: برا زۆر چاکە و خوا قادرە بەسەر هەموو شتێکا، بەڵێ، وەحی هەر بۆ پێغەمبەرە بەڵام ئێمەش هەین.

ڕۆژی دوایی نوێژی شێوان بوو لە پاش سوورەی فاتیحە ئەوەم وت: «تَتَبلّبّاس، دَنُوكُهُمْ عَلىٰ سَرِنَا لِنَاوِهِمْ فِي نوێژِنَا و نُفُوسُهُمْ في دلّنَا فَسَرُهُمْ بِرِيشِ بَابِهِمْ يَا لَيْتَنَا يَا لَيْتَنَا نەبوومایە لە ناویانا، لِأَنَّهُمْ كَكَلْبِهِمْ هەر ئەوەڕِن بِدَوْرِهِمْ؛ الله أكبر». کە لە نوێژ بووینەوە هەمزاغا هەستا هات بە لامەوە دەستی کردە ملم و وتی: ماموّستا بەو قورئانە ئێستا تەواوە هەموو جار لە نوێژێ هەر ئەم ئایەتەمان بۆ بخوێنە.

بە ڕێکەوت شەوی دوایی مەلا پیرۆتێکی خەڵکی ئەو بناری سەردەشتە هەبوو هاتە ئەوێ، لە پاش بەینێك کە تۆزێ لامان چۆڵ بوو مەلا پیرۆت وتی: مەلا قادر کەی ئەمە ئایەتە تۆ خوێندتەوە؟ وتم: بەڵێ ئایەتە، تووڕە بوو وتی: چۆن؟ وتم: «دوێنێ شەوێ ئەم ئایەتە لەگەڵ خەنجەرێکا هاتە خوارەوە». دەستی کرد بە پێکەنین و کارەساتەکەم بۆ گێڕایەوە.

٣٢. حەمە بچکۆڵی عەلیاغا لە پشدەر قسەی لە مەلا سولەیمانی ماوەت ئەگێڕایەوە کە چۆن حەدیس ئەخوێنێتەوە؛ ئەیوت: «مامۆستا مەلا سولەیمانی عەدیسان دەخوێنێتەوە ئەڵێ: پێغەمبەرێ بۆ عەزرەتی حونبەری گێڕایەوە ئەویش بۆ عەزرەتی حەلی گێڕایەوە، ئەویش بۆ عەزرەتی عەسەنی گێڕایەوە، لەوێوە وردە وردە هاتە خوارێ تا گەیشتە سەر عەزرەتی سەحلەبەی، لەوێوە هێنای لە مەجلیسی وەحزەکێدا وەکوو ڕمبێ چەقاندی». لەم کاتەشدا دەستی بەرز ئەکردەوە و پەنجە گەورەی ڕەپ ئەکرد و ئەینایە سەر عەرزەکە وەکوو ئیشارە بۆ چەقینی ڕمەکە بکا.

٣٣. ئۆباڵی گێڕانەوەی ئەم قسەیەش بە ئەستۆی کاك «فوئاد عارف»، ئەو بۆی گێڕامەوە: کابرایەکی گردەڵە هەبوو «لالەپاشا»یان پێ ئەوت. لەسەر ڕووبارەکەی «ئاڵیشە» ڕاوەستابوو ئەیەویست لێی بپەڕێتەوە، بەڵام نەیئەوێرا لێی بدا. لەو کاتەدا دوو کوڕی زەبەلاحی کەماڵەیی هاتن ئەوانیش ئەیانویست بپەڕنەوە چاویان کەوت بە کابرا گردەڵەکە وەستابوو وتیان: «گۆرانە، ئەوە تۆ مەلەوانی لێرە ڕاوێستیاگی؟» وتی: ئا. وتیان: نامانپەڕێنیتەوە یەکێ وە قەرانێ؟ وتی: با. ئینجا پێی وتن: ئێوە بکەونە ئەملاوئەولامەوە تا بتانگرم و بتانپەڕێنمەوە. خۆی کەوتە

ناوەڕاستیان. پشتێنەکەی هەردووکیانی توند گرت و دایان لە ئاوەکە، گەیشتنە نێرگەی ئاوەکە ئاو بە گوڕ بوو پێی کابرای کورتەڵەی لە زەوی بڕی، بەڵام لەبەر ئەوە ئەوان زەلام و بەهێزتر بوون، ئاو زۆری بە سەریانا نەشکا. ئەوەندە هەبوو کابرای کورتەڵە خۆی بەوانەوە گرتبووەوە کە ئەوان ئەیانبینی ئەم قاچی تاقمانە جووت ئەکا لەناو ئاوەکەدا ئەیانوت: «ئەها گردە کەوتە مەلە، دەك دایك بۆت نەناڵێنێ».

**٣٤.** کابرایەکی «باشکی» حەمەوەیسی ناو بوو. گەماڵێکی ئەبێ زۆری خۆش ئەوێ پێی ئەوت «سەبۆر». بەرخێکی لە ڕانەکە بۆ جیا ئەکاتەوە و بۆی دەستنێژ ئەکا. بەرخ زاوزێ ئەکا و ئەبن بە پانزە، بیست سەر؛ کوتوپڕ گەماڵەکە ئەتۆپێ. مامە وەیس زۆر بۆی دڵگران ئەبێ، لەگەڵ ژنەکەیا کە «پەخە»ی ناو ئەبێ پرسەی بۆ دائەنێن و شین و شەپۆڕێکی زۆری بۆ ئەکەن. پاش بڕانەوەی پرسە لەگەڵ پەخەی ژنیا ئەچن بۆ لای مەلا کە میراتەکەیان لێ بەش کا. کارەسات لە مەلا تێئەگەیەنن؛ مەلاش بەلایەوە نێچیرێکی باشی دەست کەوتووە ئەڵێ: مامە حەمەوەیس شەش سەری بۆ تۆ مامە حەمەوەیسیش ئەڵێ: «ئەی وە قوروانی دەمت وم». چار سەریشی بۆ دایە پەخە. دایە پەخەش ئەڵێ: «ئەی بێم وە دەورتا». ئینجا چاوەڕێی ئەوەن کە ئەوی تریشیان لێ بەش کا. لە پاشا مەلا ئەڵێ: ئەوەشی کە ماوەتەوە بۆ من.

مامە حەمەوەیس تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: «ئاخر مەلا بێفەڕە، تۆ باوکی سەبۆر بوویت؟ تۆ برای سەبۆر بوویت؟ تۆ چی سەبۆریت؟ لەم ناوەدا خۆت قوت کردگەسەوە دەمت ئێژی برینگی پەز بڕینەوەس، ئێمە کەسوکاری سەبۆرین تۆ گووخۆری کوێیت؟»

٣٥. حاجی مستەفا پاشا گێڕایەوە وتی: ئەو ساڵە من ئەمیری حەج بووم. لە عەرەفاتا تەواف ئەکەین، قەرەباڵغیەکەی لەوەدا نییە، گۆشت کەوتۆتە سەر گۆشت. سەیرم کرد وا کابرایەکی کوردی شارەزووری لای خۆمان لە بەردەممەوەیە، ئافرەتێکی کەتەی زلەی سەنگاڵی لە پێش کابراوەیە و سمتی بە تەواوی توند بووە لە بەری کابرا. لە تەوافیشا جگە لە جەنجاڵییەکە هەرکە لە عاستی خۆی و لەبەر خۆیەوە خەریکی دوعا کردن و پاڕانەوەیە. گوێم لێ بوو کابرای بەردەمم هەموو دوعا و پاڕانەوەکەی ئەوەبوو بە کوردی ئەیوت: «بینایی چاوان گشت جارێ خۆت فەرمووگتە هەرکە بچێ تەوافی ماڵی من بکا حۆرییەکی پانوپۆڕی ئەدەمێ. ئێستە ئەم حۆرییە قۆڕە کە تۆ لێرە داگتە وە من، من چی لێ بکەم؟ ئەوە من جێگەم نییە تۆزی قنگم بجووڵێنمەوە ئێستە چۆن ئیشی وام پێ ئەکرێ؟ ئاخر ناوێ تۆ خۆت نەختێکی لێ بزانی کە چ وەختێ وەختی حۆرییە؟».

٣٦. کابرایەك هەبوو خەڵکی ئەو شارەزووری دەشتی «موان»ـە بوو، لەگەڵ مەلا و فەقێدا زۆر دانیشتبوو؛ هەموو جار گوێی لێبوو کە مەلا سوورەتی ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ﴾ی ئەخوێند و پێی خۆش بوو. ڕۆژێك ئەپرسێ لە مەلا و ئەڵێ: مامۆستا ئەوە ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ﴾ یانێ چی؟ ئەویش ئەڵێ: برا ئەوە خوا سوێنی بەو دووانە خواردووە، «تین» یانی هەنجیر و «زیتون»یش زەیتوونە.

ئەم کابرایە ئەمە ئەگرێتە دڵ و جارێك ڕێی ئەکەوێتە ڕێژاو، هەنجیری بۆ دێنن ئەیخوا سەیر ئەکا زۆر خۆشە، ئەڵێ: «بیم وە ساقەت بینایی چاوان! خاست لێ زانیگە وا سوێندت پێ خواردگە».

ماوەیەکی‌تری پێ ئەچێ لەو خوارە تووشی دارێك ئەبێ بەرێکی سەوزی خڕی پێوەیە ئەپرسێ: ئەمە چییە؟ پێی ئەڵێن: زەیتوونە. زۆر بە ئارەزووەوە پەلاماری ئەدا، چەند دەنکێك لە دارەکە ئەکاتەوە و ئەیخاتە دەمی. ئەو زەیتوونەش دیارە هێشتا کاڵ و کرچ و نەگەیشتووە. سەیر ئەکا تاڵ و تفت و تیژە لەوانەیە دەمی هەلاهەلا ببێ، ئەیتفێنێتەوە و [ئەڵێ:] «ئەرێ بینایی چاوان! [ئەوە خۆت لێت خواردگە وا سوێندت پێ خواردگە؟!]».

**.٣٧** ئەحەی کرنوو جارێك ڕێی ئەکەوێتە کەرکووك، ئەچێتە مزگەوتەکەی ناو بازاڕ بۆ نوێژ کردن. ئەیەوێ دەستنوێژ بشوا ئاو نییە. مجەورەکە گۆزەڵەیێ ئاوی بۆ دێنێت دەستنوێژەکەی ئەشوا و بۆ نوێژەکە نامێنێتەوە. ئەیەوێ بڕوا، مجەورەکە سەری ڕێی پێی ئەگرێ ئەڵێ: کاکە بێنە پارەی ئاوەکە، ئەویش ئەڵێ: پارەی چی؟ من دەستنوێژم شۆردووە خۆ بەفراوم نەخواردۆتەوە. ئەڵێ: من ئەمانە نازانم ئاو لێرە بە پارەیە، بێنە پارەی ئاوەکە. ئەمیش هیچی پێ نامێنێ، پشتی تێ ئەکا و تڕێکی بۆ ئەکەنێ ئەڵێ: «برا ئەوە خۆت و ئەوە دەستنوێژەکەت ئیتر بۆچ وازم لێ نایەنی».

**.٣٨** کابرایەکی مەنگوری زستان ئەبێ ئەچێتە سەر ئاو، دەست بە ئاو ئەگەیەنێ. لە پاشا دەست ئەکا بە دەستاوەکەدا و ئاو ئەدا بە خۆیەوە، لەو وەختەدا کە ئاوەکە فڕێ ئەدا بۆ خۆی لە ترسی ساردی ئاوەکە خۆی بەرز ئەکاتەوە و ئاوەکەی لێ ناکەوێ ئەڵێ: «ئەی لە دایەلێت بەرم نەیگرت!!». چەند جارێك هەر ئاو ئەدا بە خۆیەوە خۆی بەرز ئەکاتەوە و نایگرێ ئاخر جار ئەڵێ: «هەر ئەوەیە ئەمجارەشت

بۆ فرێ ئەدەم گرتی‌گرتی، نەیگرت بە گونی بارگیرەکەمەوە».

٣٩. فەقێیەکی خەڵکی «سیساوا»ی خۆشناو هەبوو هەر ئەیخوێند و هیچ فێر نەئەبوو. پێیان وت: کەوایە بۆچ واز ناهێنی؟ ئەویش وتی: «هەر دەخینم هەر دەخینم تا دەگەمە شەرح حەقایدان چم زانی چم زانی، چم نەزانی دەگەڕێمەوە سەر حەواملان. دیسان هەر دەخینم هەر دەخینم تا دەگەمە شەرح حەقایدان چم زانی، چم نەزانی دەگەڕێمەوە سەر حەواملان. ئەمجارەش هەر دەخینم هەر دەخینم تا دەگەمە شەرح حەقایدان چم زانی چم زانی، چم نەزانی بە ساقی کێرمەوە».

٤٠. حاجی ئێلخانی دێبوکری ئەیەوێ ئەسپێك بکڕێ، بە عەلیاغای کوڕی ئەڵێ: عەلی ڕۆڵە ئەسپێکی باشم بۆ پەیدا کە بیکڕم. عەلیاغاش خۆی ئەسپێکی باشی ئەبێ ئەڵێ: چاك وایە بیفرۆشم بە باوکم. ئەسپەکە دێنن و ئەیگێڕن بە بەردەمی حاجی ئێلخانیدا حاجی ئەڵێ: غارێکی‌کەشی پێ‌بکەن. کە کابرا ئاوزەنگی لێ ئەدا ئەسپە تڕێك ئەکەنێ. حاجی ئێلخانی ئەڵێ: «لاییەن لاییەن بە ڕیشی باوکی خاوەنیەوە!».

٤١. کابرایەکی کورد کوڕێکی هەبوو ناردبوویە فەقێیەتی. کابرا ڕۆژێك ئەچێ ئەبێ بە میوانی فەقیەکان. کوڕەکەی ئەویش سوختە بوو، ئەبوایە خزمەتی فەقیەکانی‌تری بکردایە. کابرا کە گەڕایەوەماڵی خۆیان لێیان پرسی: کوڕەکەت لە چییایە؟ وتی: «هەر دەنگی لێوە مەکەن، ماشەڵڵا نان و چای ئەوگشت مەلا زل زلانە وە دەست ئەوە، تا ئەو نەیژێ نان بخۆن و نانیان بۆ دانەنێ کەسیان ڕایەی ئەوەیان ناکەوێ نان بخۆن. ماشەڵڵا فرە زل بووگە».

٤٢. شێخ مەحمووی شێخ سەعید مەلیك بوو لە سولەیمانی. شێخ ئەلییەك هەبوو پێیان ئەوت: «شێخەلیە پەڕۆ» لە مزگەوتی مەلا ئەمینی مام ڕۆستەم بوو. ئەویش بە ناوی شێخایەتییەوە جارجار ئەکەوتە قسە.

شەوێك شێخ مەحموو چەند کەسێکی لەگەڵا ئەبێ ئەچێتە مزگەوتەکە. زەلامەکان لەگەڵی ئەهلی جەماعەتەکە لەسەر سەکۆی مزگەوتەکە ئەبن، شێخ خۆی ئەچێتە ژوورەکەی شێخەلی، کام لات ئێشێ، شلّپ و کوت دایئەگرێ. ئەوەندەی لێ ئەدا نیوەمەرگی ئەکا و سەریشی ئەشکێنێ.

لە پاشا کە ئەو ئەڕوا شێخەلی دێتە دەرەوە خوێنەکە ئەشواتەوە. ئەهلی جەماعەتەکە پێی ئەڵێن: یا شێخ ئەوە مەلیك لە ژوورەوە بوو ئەو شلّپوکوتە چی بوو؟ ئەویش ئەڵێ: «شێخ بێ قەزا بێ لێم ناگەڕێ، خەریکی گاڵتە و چنگەپرچێ بووین ئەوەتە ئاخری سەریشم شکا. پێم وت: ئیتر جارێکیتر من بێت و گاڵتە لەگەڵ تۆ ناکەم ئیتر مەیەرەوە».

٤٣. پیاوێکی کورد لەو سەرە مناڵە کوردێکی ڕاگرت بۆ ئەوە لە ماڵا ئیش و فرمانیان بۆ بکا. شەوێك پیاوەکە چوو بۆ ماڵی ئاشنایەکی، بە کوڕەکەی وت: فانۆزەکەم بۆ هەڵگرە. ئەویش فانۆزەکەی هەڵگرت، بەڵام لە دوای ئاغایەوە ئەڕۆیشت. ئاغا پێی وت: پێش کەوە کوڕەکە وتی: قوربان ڕایەم ناکەوێ پێش کەوم. ئاغا وتی: ئەگەر پێش نەکەوی ڕووناك نابێ. خزمەتکارەکە وتی: ئاخر بۆ من بێعەدەبییە پێش ئاغای خۆم کەوم. ئەویش وتی: ڕۆڵە مادام چرات بە دەستەوەیە ئەبێ پێش کەوی. خزمەتکاری خەڵکیش کە چرا ئەگرن بە دەستەوە لە پێش ئاغایانەوە ئەڕۆن. ئەمجا خزمەتکار ئیتر پێش کەوت.

بەیانی ئاغا وتی: ڕۆڵە ئەو سەبەتەیە هەڵگرە بچین بۆ بازاڕ هەندێ گۆشت و شت بکڕین. کوڕەکە سەبەتەکەی هەڵگرت و کەوتە پێش ئاغایەوە. ئاغا نەوی لە قۆڵی و وتی: هەتیو پێش مەکەوە ئەبێ لە دواوە بڕۆی. هەتیو وتی: ئەی شەوێ بۆچ وتت لە پێشەوە بڕۆ؟ وتی: ئاخر شەوێ وا بوو ئێستە وایە. کوڕە هەر سەبەتەکەی دانا و وتی: «ئاغا بە دوعا، پاش کەوە و پێش کەوە بە من ناکرێ» و لێی دا ڕۆیشت.

٤٤. ژنێك لە «چنگیان» هەبوو ناوی پوورە فاتە بوو؛ ئافرەتێکی زۆر لە خواترس و چاك بوو. خزمەتی فەقیەکانی زۆر بە دڵ ئەکرد و جلی بۆ ئەشتن، چێشتی بۆ ئەبردن، بەو بۆنەوە پێیان ئەوت: «دایکی فەقیان». لەگەڵ ئەمە قسە قوتیش بوو؛ جارجار ئەچوو سەری ئەخستە سەر فەقیەکان و گاڵتەی لەگەڵ ئەکردن ئەیوت: «فەقێ ژن ناهێنێ هەر کۆی ئەکاتەوە کۆی ئەکاتەوە، لە ئاخرا ژنێك دێنێ بە شەوێك هەمووی ئەڕژێنێتە ناویەوە، ئەبێ بە کوڕێکی سەر زلی چوارپەل ئەستوور، ناوی ئەنێ مەلا عەبدوڵڵا».

٤٥. کابرایەکی کورد سەد قڕان ئەخاتە باخەڵی و ئەچێتە بازاڕ بۆ کەر کڕین. لە ڕێگادا تووشی مەلاکەیان ئەبێ، لێی ئەپرسێ: بۆ کۆی ئەچی؟ ئەڵێ: ئەچم کەرێك ئەکڕم. مەلا ئەڵێ: «بڵێ: "إن شاء الله"». ئەویش ئەڵێ: مامۆستا ئینشائەڵڵای بۆچییە، پارەیە لە باخەڵمایە و کەریشە لە بازاڕایە، ئیتر ئەم ئینشائەڵڵایە بۆ چییە؟

کابرا ئەڕوا هێشتا ناگاتە بازاڕ، گیرفانبڕ پارەکەی لێ ئەدزێ. ناچار بە شوێنەکەی خۆیا لووس و باریك ئەگەڕێتەوە. لە ڕێگادا تووشی مامۆستا ئەبێتەوە، مەلا لێی ئەپرسێ: ها برا کەرت کڕی؟ ئەڵێ: نە

ئینشـائەڵڵا. ئەڵێ: بۆچـی؟ ئەڵێ: پارەم پێ نەبوو ئینشـائەڵڵا. ئەڵێ: ئەی پارەکەت چی لێهات؟ ئەڵێ: دزییان ئینشائەڵڵا. ئەڵێ: ئاخر پێم نەوتی بڵـێ ئینشـائەڵڵا. ئەڵـێ: «گـوو بە ڕیشـی بابت ئینشـائەڵڵا، گـوو بە گۆڕی بابم ئینشائەڵڵا بۆ ئیشێ کردم ئینشائەڵڵا!».

٤٦. مەلاکەی عازەبان لە مزگەوتا وەعزی ئەدا ئەیوت: ئافرەت کە منداڵی ئەبـێ خواوەنتەعـالا مەلایەکـەیـەك ئەنێـرێ شـەرمی ئافرەتەکـە زل ئەکاتـەوە تا مناڵەکـەی ئەبـێ، ئەمجـا مەلایەکەیەکی‌تر ئەنێری شەرمەکەی ئەهێنێتەوە یەك و وەکوو خۆی لێ ئەکاتەوە. کوێخا ئەوڕەحمانـی عازەبانـی لـەوێ ئەبـێ هـەر ڕاسـت ئەبێتـەوە و ئەڵـێ: «مامۆستا بـەو قورعانـەی تۆ ناوتەتـە سـەر ڕانـی ڕاستت، مەلایەکـەی دووهەم سەری نەکردووە بە ماڵی منا!».

٤٧. مەلاکەی «کونەماسی» وەعزی ئەدا ئەیوت: هەرکەسە ئەگەر نانێ بدا لە ڕێگەی خوادا خوا حۆرییەکی ئەداتێ، سەری لە ڕۆژاوایـە و پێـی لـە ڕۆژهـەڵات. عـەزە کونەماسـی هەبـوو لـە کۆڕەکـەدا دانیشتبوو، هەڵیدایە وتی: «مامۆستا ئێستە ئێمە واین لە ناوەڕاستی زەویـدا، ئەگـەر نانێـك بـدەم لـە ڕێگای خـوادا و خوا حۆرییەکـی وام بداتێ من ئەکەومـە عاسـتی ناوکـی. خۆ ئەگـەر بمـەوێ ماچێکی بکـەم ئەبێ هەر شـتێکم هەیـە و نییـە بیـدەم بـە هەقـی کاروانا و شـەش مانگـەڕێ بەڕێ کەوم بۆ ئەوە بگەمە عاستی دەمی و ماچێکی بکەم. جگە لەوە ئاگام لە خوار ناوکیشی ئەبڕێ کە چی بەسەر دێ. وەڵڵا مامۆستا نە ئەم نانە ئەدەم و نـە ئـەم ماچـەم ئەوێ و نە ئەم هاتوچۆی ڕێگایەش ئەکەم بە تووشـی خۆمەوە.

٤٨. زیوەرئەفەندی شاعیر و مەلا سەعیدئەفەندی گەلێ جار لە بەرهەیوانەکەی مزگەوتی عرفانا لە سولەیمانی دائەنیشتن و بە قسەی ئەدەبی و باسی شیعری مەولەوییەوە ڕایانئەبوارد. مجەورێکی مزگەوتەکە هەبوو گوێی لە قسەکانیان ئەبوو کە شیعری مەولەوییان ئەخوێندەوە. ڕۆژێك بە زیوەرئەفەندی ئەڵێ: ئەم مەولەوییە ئەم قسانە چییە وتوونی: «هەردە و بەردە و مەردە»؟ زیوەرئەفەندیش ئەڵێ: دە ئەگەر تۆ ئازای شیعرێکی وا بڵێ. ئەویش ئەچێتەوە ژوورەکەی خۆی و لە پاش تۆزێك دێتەوە دەرەوە ئەڵێ: زیوەرئەفەندی گوێت لێ بێ ئەوا شیعرت بۆ ئەڵێم وەکوو مەولەوی. ئەڵێ: بڵێ. ئەڵێ:

**مشـتێ هەلیلە کەفلەمەش کەردە**

**هەر فیرەش مەیۆ جە شاخ و هەردە**

زیوەر ئیتر هیچی پێ ناوترێ.

٤٩. مەحموبەگی ڕەزابەگ لە کەلار لە کاتی خۆیا سەرخۆش ئەبێ. بە خەیاڵی سەرخۆشی تووڕە ئەبێ لە پیاوێکی کوردی جاف ـ کە پیاویان ئەبێ ـ. ئەم کابرایەش کە ئەزانێ وا مەحموبەگ لەسەر هیچ لێی تووڕە بووە و جنێوی داوەتێ، بە نازی خزمەتکارییەوە بە ڕوویا هەڵئەچێتەوە. لە بەیانییا بە کابرا ئەڵێن: بابە، ئەوە مەحموبەگ سەرخۆش بوو بۆیە لێت تووڕە بوو، ئەگینا ئەو لە کەس تووڕە نابێ. ئیتر کابرا ئەچێتە لای و داوای لێبوردنی لێ ئەکا و ئەڵێ: «میرم وە قەورەکەی باوکت نەمزانیوو لە گووەکەت خواردگەسەوە. ئەوێ لێم نەگری!».

٥٠. لەو بەر کێوە ئافرەتێك لەناو کۆمەڵێکا ـ کە میوانی کرابوون ـ دانیشتبوو. مناڵێکی هەبوو تازە فێری قسەکردن ئەبوو، مناڵەکەی

لە باوەشیا دانابوو. شەرع شەرمی بۆ نییە، ژنەکە یەکێکی دەنگ گەورەی پیا هێنا، دەستی کرد بە لێدانی منداڵەکە و بە چەپۆك بەربووە سەروگوێلاکی منداڵی بەسەزمان. مناڵ لەبەر گریان نەیپەرژایە سەر هیچی‌تر؛ دایکەش هەر وازی نەئەهێنا و ئەیوت: هەتیو حەیای ئینسان ئەبەی. ئەوەندە زۆری لێ دا تەنانەت ژنەکانی‌تر کەوتنە سەر ئەو بڕوایە کە ئەمە منداڵەکە بووە ئەم تڕەی کەندووە، بە هەرجۆر بوو لە ژێر چنگیان دەرهێنا.

لە پاش تۆزێك سفرەی نان دانرا و هەموو نیشتنە سەر سفرەکە، ئافرەتەکە دڵی بە منداڵەکەی خۆی زۆر سووتا کەوا بە ناهەق ئەوەندەی لێ‌داوە، کەوتە دڵنەوایی کردن و ماچ‌کردنەوەی و دەست بە سەرا هێنانی و دەستی برد گرتگە گۆشتێکی سوورکراوەی لە بەردەما دانا.

منداڵەکە لەم مێهرەبانیانەی داکی دڵی هاتەوە شوێنی خۆی و دەستی کرد بە خۆ شیرین کردن لە بەرچاو دایکەکەیەوە. ئەمجا بە دەنگی بەرز وتی: «دایەگیان ئەگەر ئەمجارەش بتڕی دیسان لێم ئەدەیتەوە؟!».

٥١. حاجی سەعید مەلا حەسەنی عەلاف گێڕایەوە وتی: حەسەن ئاغای قەرەنی هەبوو لە سولەیمانی لە ئاخر و ئۆخری ژیانیا هەموو دەم هەر لە مزگەوتی حاجی‌حان خەریکی نوێژ و تاعەت بوو. هەموو پاش نوێژێك وەکوو خەڵکی‌تر دەستی بەرز ئەکردەوە و دوعای ئەکرد. یەکێك لە دوعاکانی ئەوە بوو ئەیوت: «خوایە محە چاوشین هەیە پەستەکێکی لە بەرایە، جامانەیەکی شڕی چڵکنی ئاڵاندووە لە مشکییە پیسەڵەیەکەوە و بەستوویە بە سەریەوە، کە لە دەرگای مزگەوتەکە دەرئەچێ بەلای چەپا قاپی سێیەم نە هی چوارەم، بەرانبەر بە ماڵی حاکمە سیاسییەکە ماڵی ئەوانە، لێت تێك نەچێ حەقی منی لێ بسێنە».

٥٢. مەلا محەمەدی چرچە قەڵایــی گێڕایەوە وتی: ئەوا جەژنی قوربانە نۆبەنێکمان هەیە ویستمان بیکەین بە قوربانی. بە خێزانەکەم وت: ئافرەت بەڵکوو قەسابێکی باشمان دەستکەوێ کە پێستەکەی ئەگروێ وای بگروێ کونی تێ نەکا بیکەین بە مەشکە بۆ خۆمان.

ئەویش وتی: ئەیەڕۆ پیاوەکە شتی وا چۆن ئەبێ پێستەکەی هەڵگرین بۆ خۆمان؟ ئەمە قوربانییە ئەبێ هەمووی ببەشینەوە، گوناحە چۆن ئەبێ لێی هەڵبگرین. وتم: ئافرەت وس بە، بەخوا ئەگەر هەموو گۆشتەکەشی بخۆین و تۆزێ لە کلکەکەی ببەشینەوە هێشتا خێری دوو قوربانی خەڵکیترمان دەست ئەکەوێ. وتی: چۆن؟ هەر وا واقی وڕما. وتم: «ئافرەت خوا کەی بە خۆیەوە دیوە مەلا خێر بکا؟ سەرە کلکە نۆبەنێکی ئێمە ئێستە دوو گای قوربانی خەڵکیتر ئەخوا!».

٥٣. هەژار گێڕایەوە وتی: پاش ئەوە کە ڕەزاشا لە ئێرانا هاتە سەر حوکم، فەرمانی دەرکرد کە هەموو کەس ئەبێ کڵاوی پەهلەوی لە سەر کا. لەسەر ئەمە لە وڵاتی ئێرانا هەرا لەناو مەلاکانا پەیدا بوو کە ئایا بە لە سەرکردنی کڵاوی پەهلەوی کافر ئەبن یا نابن؟

مەلا سەلیمێکی «ژێ»یی هەبوو لە سابڵاخ ئەو هەر لەسەر ئەوەبوو کە هەرکە ئەم کڵاوە لە سەر کا کافر ئەبێ. هەندێ لە مەلایانیتریش بەرپەرچیان ئەدایەوە و ئەیانوت: وا نییە. ئەویش ئەیوت: «ئەوا کڵاوپەهلەوی بۆ ئێوە، ئەی بۆ تەقویمی باخەڵی چ دەبێژن؟ بەویش هەر کافر نابن؟!».

٥٤. مەلا عەبدولحەمیدی بانەیی یەکێك بوو لە موستەعیدە هەرە خوێندەوار و چاکەکانی شێخ عومەری «اِبنُ القَرَداغی»

لە سولەیمانی کە لە مزگەوتی «قامیشەکان» بوو. مەلا حەمەمینە شێتەش هەبوو هەر لە سولەیمانی، شەوێکی سێشەنبە ئەم مەلا حەمەمینە ئەچێتە لای مەلا عەبدولحەمید لە قامیشان پێی ئەڵێ: مەلا عەبدولحەمید چایەکی بێ‌کلکەم بۆ لێنێ. مەلا عەبدولحەمیدیش ئەڵێ: تۆ ئەقڵت نییە، چای بێ کلکە یەعنی چی؟ ئەویش ئەڵێ: مەلا تۆ عەقڵت نییە چای بێ‌کلکە یەعنی هەر بۆ خۆم و خۆت بێ و کەسی بە سەرا نەیەت و کلکی لێ پەیدا نەبێ.

مەلا عەبدولحەمیدیش بە سوختەکەی ئەڵێ: سەماوەرەکەیان بۆ تێ‌خا چایەکەیان بۆ دروست بکا و خۆیشی بچێتە دەرەوە بۆ ئەوە هەر ئەمان بە تەنها بمێننەوە. سوختە چا ساز ئەکا و خۆی ئەچێتە دەرەوە. ئەمان لە ژوورەوە دەرگاکە دائەخەن، مەلا عەبدولحەمید دەست ئەبا بۆ ئیستکان کە چا تێ‌کا، تەق تەق لەو دیوەوە ئەدەن لە دەرگا. مەلا عەبدولحەمید هەڵئەستێ دەرگا ئەکاتەوە کە سەیر ئەکەن سێ چوار فەقێی مزگەوتی‌تر بە «سلام علیکم» ئەکەن بە ژوورا. مەلا حەمەمین تووڕە ئەبێ، ناوچەوانی ئەدا بە یەکا، ئەیەوێ قسە بکا، تەق سێ چوار فەقێی‌تریش دێن و ئەوانیش سەلام دائەکوتن. مەلا حەمەمین ئیتر ئاگری تێ بەر ئەبێ و ئەوەندەی‌تر شێت ئەبێ. ئەڵێ: دایکتان وا لێ‌کەن ئەمە کەڵە هێرە وا کۆ بوونەتەوە؟ هەر هەڵئەسێ ئەکا بە کەوشەکانیا و بۆی دەرئەپەڕێ. مەلا عەبدولحەمید هەڵئەستێ ئەیگرێ پێی ئەڵێ: مەلا دانیشە چایەکەت بخۆرەوە بۆ کوێ ئەچی؟ چا بۆ تۆ لێ‌نراوە. ئەڵێ: قوزەڵقۆرت ئەخۆمەوە، من وتم: چای بێ کلکە، ئێستە هەزار کلکی لێ پەیدا بوو. هەرچەندە مەلا عەبدولحەمید لێی ئەپاڕێتەوە کە تۆ دەخڵت چییە، چەندە ئەخۆیتەوە بخۆرەوە، مەلا حەمەمین ڕازی نابێ و هەر

ئەڵێ: من وتوومە چای بێ‌کلکە، ئێستە ئەم ناجسنانە هەزار کلکیان لێ پەیدا کرد. بەبێ ئەوە پیاڵە چایەك بخواتەوە لێی دا ڕۆیشت.

٥٥. جوولەکەیەك هەبوو لە بوکان «خواجە مووشێ»ـی ناو بوو. ئەم خواجە مووشێیە کچێکی هەبوو ـ بلامانێ ـ هەموو کەس پێی فێر بووبوو؛ تەنانەت خواجە مووشێ خۆیشی ئەیزانی. لە ناکاو ڕۆژێك خەبەریان دا بە خواجە مووشە کە کچەکەت موسڵمان بووە. ئەویش هەندێ ڕاما و پاشان وتی: «با بڕوا ئەو حیزە هەر بۆ ئیسلام باشە!».

٥٦. کابرایەکی قزڵجەیی ناوی خۆی نابوو شاعیر و بڕە شیعرێکی دانابوو بردی بۆ شێخ ڕەزای تاڵەبانی کە پەسەندێکی بۆ لەسەر بنووسێ، وە پێشی وت: کە «ڕەعد»م کردووە بە ناوی شیعر بۆ خۆم. شێخ ڕەزاش ئەم شیعرەی لە باتی پەسەند بە سەر بڕە شیعرەکەیەوە بۆ نووسی:

ئەی تڕت ڕەعد و تست ڕەشەبا «هکـذا إرثکـم جـدّاً و أبا»

٥٧. شێخ بابەعەلی تەکیەیی، مەلا عەزیزی موفتی سولەیمانی، شێخ عیسامەدینی عەواڵان، سەید ئەحمەدی خانەقا لە کەرکووك، ئەمانە هاوڕێی دەوری کۆن و فەقێیەتی بوون. جارێك شێخ عیسامەدین لە عەواڵانەوە دێت بۆ سولەیمانی بۆ دیدەنی شێخ بابەعەلی و موفتی. پێش چەند ڕۆژێك بڕیار ئەدەن بچن بۆ کەرکووك بۆ دیدەنی سەید ئەحمەد. ئەچن و حەفتەیەك لەلای سەید ئەحمەد ئەمێننەوە. سەیدیش ڕۆژبەڕۆژ خزمەتیان زیاتر ئەکا. ئەمجا ئەکەونە سەر ئەوە کە بگەڕێنەوە، سەید ئەڵێ: ئەم نیوەڕوەش نانی نیوەڕۆ پێکەوە ئەخۆین و پاشان خواتان لەگەڵ؛ بەم جۆرە ڕازی ئەبن.

سەید ئەڵێ: بۆ ئەو نیوەڕۆیە نانێکی زۆر نایاب دروست ئەکەن و ئەڵێ: شۆربایەکی بڕوێشیش لێ بنێن، بەڵام پێش هەموو خواردنێك شۆرباکە بێنن و ئیتر بوەستن. نیوەڕۆ دێت و سفرە ڕائەخەن، قەرەوانەی شۆربای ساوەر لەسەر سفرەکە ڕیز ئەکرێ و ئیتر هیچی‌تر نایەنن. شێخ بابەعەلی و ئەوان هەر چاوەڕێ ئەکەن هیچی‌تر دیار نییە. سەیدیش ئەڵێ: یا شێخ فەرموو نان بخۆن. شێخ بە ناچاری دەست بۆ نان و شۆربا درێژ ئەکا و کەوچکێکی لێ ئەکاتە دەمی سەیر ئەکا بێ خوێشە. ئەوا سەی ئەحمەدیش لەو بەری سفرەکەوە دانیشتووە، بابە عەلی ڕوو ئەکاتە موفتی ئەڵێ: «موفتی، بەڕاستی سەید ئەحمەد تا ئێرە باشی هێنابوو، بەڵام لێرەدا گووی تێ‌کرد».

سەید گوێی لێ ئەبێ و هەموو مەجلیس دەست ئەکەن بە پێکەنین. سەید ئەڵێ: بابە عەلی مەبەستم ئەم قسەیە بوو کە بڵێیت. ئەمجا ئەمر ئەکا نانی تەواو دێنن.

**٥٨.** دیسان جارێکی‌کە هەر ئەم شێخ بابەعەلییە ئەچێ بۆ دیدەنی سەید ئەحمەد لە کەرکوك. کە ئەچێتە خانەقا ئیشی ئاودەستی ئەبێ. ئاودەستەکان بە تەنیشت یەکەوە بوون دیواری بەینەکەیان ڕووخابوو، زەلام کە دابنیشتایە وەکوو لە دەشتا دابنیشتایە وابوو. بابەعەلی ئەچێتە سەر ئاودەستێك زۆری پێ ناچێ زەلامێك دێتە ئاودەستەکەی تەنیشتیەوە، بەڵام بە تەواوی لە یەك دیارن. شێخ بابەعەلی دەست ئەبا قوتوو جگەرەکەی دەردێنێ و جگەرەیەك ئەدا بە کابرای تەنیشتی و پێی ئەڵێ: «بەخێر بی!».

ئەمان لەمەدا ئەبن یەکێکی‌تریش دێ لەولایەوە دائەنیشێ،

جگەرەیەکیش ئەدا بەو و بەخێرهاتنی ئەویش ئەکا. کابراکان واقیان وڕ ئەمێنێ. ئەڵێ: برا بۆچ واقتان وڕ ئەمێنێ؟ یەکێ لە دیوەخان سەید ئەحمەدا دابنیشێ ئەبێ جگەرەش بکێشێ و قسەش بکا خۆ لەسەر قەبران دانەنیشتووین».

ئیتر لەو ناوەدا ئەبێ بە هیلکەهیلك و فڕکوهوڕ. خەبەر ئەگا بە سەید. سەید ئەحمەد ئەڵێ: «ئەم بەزمە ئەبێ بەزمی بابەعەلی بێ. ئەڵێ: گورج عابخانەکان چاك بکەنەوە تا بابەعەلی دیواخانێکیتری بۆ ڕانەکێشاوین و دیرەکێکیتری نەداوەتە ژێر».

**٥٩.** کوڕێك هەبوو لەو بەر کێوە گەورە بووبوو. دەر و دراوسێ بە دایك و باوکەکەیان ئەوت: بەسە ژنێکی بۆ بێنن و بۆی دانێن با ئیتر ئەوەندە قوتەقوت نەکا. کوڕەش گوێی لەم قسانە ئەبوو.

لە ئەنجاما کچێکیان بۆ دیەوە و بۆیان هێنا، شایی کرا و بۆیان کردە پەردەوە و کوڕیان کردە ژوورەوە. خەڵك بە تەمان کوڕ ببێ بە زاوا بێتە دەرەوە. کوڕ دیار نەبوو تا بەیانی. بەیانی هاتە دەرەوە هیچ قسەی نەکرد، کەسوکارەکەش هیچ دەنگیان لەگەڵ نەکرد، هەتا شەوی دواییش، هەر وەك شەوی پێشوو وا بوو هیچ دەنگ نەبوو. لە پاشا دایکەکەی چوو بە لایەوە وتی: کوڕم ئەوە بۆچ هیچ دەنگت نییە؟

کوڕە وتی: دەنگی چیم بێ؟ ئەوە نییە دەنگم لێوە دێت و قسەش ئەکەم؟ وتی: کوڕم ئەوە ناڵێم، ئەڵێم بۆچ نابیت بە زاوا؟ ئەڵێ: بۆچ نەبووم؟ ئەڵێ: کوا؟ ئەڵێ: ئەی ئەوە نییە ژنەکەتان هێناوە و داتان ناوە. دایکیشی ئەڵێ: ئەی دامان ناوە ئاخر ئەبێ بچی بەلایەوە. کوڕەش ئەڵێ: ئەی هەموو جار ئێوە نەتانئەوت ژنێکی بۆ بێنن و بۆی دانێن، ئەوا داتانناوە ئیتر چی،

هەموو دەم سەیری ئەکەم دانیشتووە.

دایکەکە سەیری کرد ئەمانە هیچی کەڵك ناگرێ. کە شەو داهات پەلی کوڕەکەی گرت بردیە لای بووکەکەوە، دەعباکەی کوڕەکەی گرت و خستیە سەر دوابڕاوی کچەکە وتی: ئەوە بکە بەوەدا و خۆی هاتە دەرەوە. کوڕە لە پاشا ئەوەی کرد بەوەدا سەیری کرد خوێن پەیدا بوو. هەر هەستا دەرپێەکەی دا بە شانیا گاڕامێك دانرابوو پەلاماری گاڕامی دا و بە هەڵەداوان هات بۆ لای دایکی و دەستی کرد بە جنێودان و گاڕمی بۆ بەرز کردەوە و وتی: «دەویت باوك هەر ئێستە ئەتکوژم، کچی خەڵکی بۆ خۆی دانیشتبوو تۆ هاتی وتت ئەوە بکە بەوەدا منیش وام کرد، ئێستە کچ خەڵتانی خوێن بووگە تۆ بوویت وە سەوەوی ئەو قەتڵە. هەر ئێستە تێن ئەمکوژن تا نەیانکوشتگم با تۆ بکوژم وا ئەو خوێنە ناهەقەت کرد وەریشمەوە».

دایکی زانی کوڕەکەی بوو بە زاوا هەڕای کرد بۆلای بووکێ و خەڵکیش کوڕەکەیان گرت. لە پاشا تێیان گەیاند کە ئەوە هیچ نییە و شێوەی کوڕ بە زاوا بوون و ژن هێنان ئاوایە!.

٦٠. شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: مەلا قادری دۆڵەچەوتی لە مزگەوتی ئێمە وتی: ئەوا ڕۆژێك تام لێ‌هاتووە زۆر شپرزەم. چوومە سەر ئاودەستەکە دەستم داوەتە ژێر چەناکەم، سەیرم کرد کابرایەکی شارەزووری هاتە دەستەکەی ئەو دیومەوە. دنیا پاش عەسر بوو، عەمەلەیی کردبوو پارەکەی وەرگرتبوو. ئەویش بە ڕەحەت لێی دانیشتبوو، حیسابی ئەکرد ئەیوت: چواردە پەنجایی ئەکاتە دە ڕووپیە. شیرێکی پیا ئەهێنا و ئەیوت نەوەڵڵا، پانزە پەنجایی ئەکاتە دە ڕووپیە؛

شیرێکی تری پیا ئەهێنا. چوار ڕووپیەی بۆ کراسی بلووری، شیرێکی تری پیا ئەهێنا.

وتی منیش لەم دیوەوە وتم: برا ئەوی تری هەڵگرە بۆ سەراوی سوبحاناغا. وتی کابرا وتی: «کاورای شاری ئێژی جنۆکەی لێرەشا هەر واز نایەرن؟» هەر هەستا بەبێ ئەوە تارەت بگرێ لێی دا ڕۆیشت.

٦١. لە سەردەمی خۆیا لە سولەیمانی جۆرە ڕابواردنێک هەبووە یەکێك لەوانە [ئەوە] بووە کە دەستەدەستە و بەرەبەرە سەیرانیان ڕێك خستووە و چوون بۆ سەیران. یەکێك لەوانە سەیرانی «شەوکێڵ» بووە کە ئەچوون هەموو تفاقێکیان ئەبرد و شەو لەوێ ئەمانەوە.

شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: جارێك توجارەکانی سولەیمانی لە بەهارا کۆ ئەبنەوە بنە و بارگە ڕێ ئەخەن و ئەچن بۆ «پیری شەوکێڵ». مەلا حەمەمینەشێتە هەبوو، ئەویش لەگەڵ خۆیان ئەبەن. پیری شەوکێڵیش دوورە بە شارەوە. ماکەرێك دێنن مەلا حەمەمین سواری ماکەرەکە ئەکەن، پێی ئەڵێن: تۆ بە پێیان ناگەیتە سەر پیری شەوکێڵ سواری ئەم گوێدرێژە بە، مەنجەڵێ ماستیش دێنن ئەڵێن: ئەم مەنجەڵە ماستەش لە بەردەمی خۆتا دانێ دەستی پێوە بگرە؛ وریا بە نەڕژێ. جارجار لە دواوە سووکە نەقیزەیەك بە کەرەکەوە ئەژەنن. کەر هەڵئەتیزێنێ لەوانەیە مەلا حەمەمین داکەوێ. پێی ئەڵێن: مەلا حەمەمین بەم جۆرە تۆ ناگەیتە پیری شەوکێڵ ئەترسین داکەوی و مەنجەڵە ماستەکەش بڕژێ، چاك وایە داتبەستین بەسەر کەرەکەوە. مەلا حەمەمینیش ئەڵێ: باشە.

ئەمجا گوریسێك دێنن شەتەکی ئەدەن بەسەر کەرەکەوە بە جۆرێك ئەگەر کەر خۆیشی بگەوزێنێتەوە مەلا حەمەمین هەر دانەکەوێ.

ماوەیەکی باش ئەڕۆن و نزیکەو هەوراز ئەبنەوە، مەلا حەمەمینیش بە سواری کەرەکەیەوە لە پێشەوەیە. ئەمجا دێنن نێرەکەرێکی ڕووتی تۆڕی بەهاری ئەخەنە دوای ماکەرەکەی لەمەڕ مەلاحەمەمین. نێرەکەر کە چاوی بە کەفەڵ و بن کلکی ماکەر ئەکەوێ بۆنێکی پێوە ئەکا، حەیتەکەی یەرەق ئەبێ و بەبێ پەردە ئەپەڕێتە سەر ماکەر و لمووزی توند ئەکا لە ناوشانی مەلا حەمەمین. مەلا حەمەمینیش بەسراوەتەوە ناتوانێ جووڵە بکا، دەست ئەکا بە جنێودان و ئەڵێ: ئەم نێرەکەرە سەگبابە دوور خەنەوە، لە بەر زەڕەزەڕی نێرەکەر کەس گوێ بە قسەی مەلا حەمەمین نادا. نێرەکەریش لەبەر ئەوق و زەوق ڕێگای لێ تێك ئەچێ و وەکوو تێلا هەموو جار ئەیدا لە بن ڕان و پشتی مەلا حەمەمین. مەلا حەمەمینیش ناوێرێ دەست لە مەنجەڵە ماستەکە بەردا، لای وایە ئەگەر دەستی لێ بەردا و ماست بڕژێ خوا غەزەبی لێ ئەگرێ. ئەمجا بە هەموو دەنگیەوە بانگ ئەکا: «سەگبابینە بێن کێری ئەم نێرە کەرە بگرن با لە نوێژم نەبات!)».

٦٢. هەر شێخ محەمەد گێڕایەوە وتی: جارێك حاجی مەلا شەریفی سەعاتچی بۆ نانخواردنی ئێوارە بانگی مەلا حەمەمینە شێتە ئەکا و پێکەوە ئەچنەوە نوێژی شێوان ئەبەنە مزگەوتی حاجی مەلا ڕەسووڵ. جەماعەت هەموو لە نوێژ و ورد و شتە ئەبنەوە، مەلا حەمەمین هەر لێ نابێتەوە. حاجی مەلا شەریف ئەڵێ: مەلا حەمەمین خێراکە با بچینەوە. ئەڵێ: مەلا حەمەمین هەستە با بڕۆین. ئەڵێ: سەبرکە جارێ پەلە مەکە. لە پاش بەینێکی‌تر حاجی مەلا شەریف دیسان ئەڵێ: مەلا حەمەمین چیت کرد؟ هەستە با بڕۆین درەنگە. مەلا حەمەمین ئەڵێ:

«قوربان سەگبابەکە جاریٚ». لە ئەنجاما بە هەرجۆر بێ مەلا حەمەمین لە نوێژ و ئەوراد ئەبێتەوە هەڵئەستێ و لەگەڵی ئەچنەوە بۆ ماڵەوە.

کە ئەچنەوە بۆ ماڵەوە حاجی مەلا شەریف لێی ئەپرسێ: مەلا حەمەمین! قوربانەکە یانێ چی و سەگبابەکە یانێ چی؟ ئەڵێ: «قوربان! سەگبابەکە بۆ ئەوە کە وازم لێ بێنیت و کەم هەڵسە هەڵسەم لێ دانیت. قوربانەکەش بۆ ئاشتیی دوایی، بۆ ئەوە لە ڕووم هەڵبێت لەگەڵت بێمەوە».

٦٣. شێخ عومەری بیارە هێسترێکی لە خانەقادا ئەبێ و ئەتۆپێ، لە پاش چەند ساڵێك پیاوێك خەڵکی هەورامانی تەخت دێت بۆ بیارە بۆ زیارەتی شێخ. شێخ لێی ئەپرسێ: «ڕۆڵە تاتەت کەی عەمرو خواش کەردەن؟» ئەویش ئەڵێ: «ساقەت بۆ! ئا ساڵە هەسەرەکەو شێخی بە ڕەحمەتو خوای شی، تاتەم تۆپا»[1].

(کابرا لە ڕووی هەڵنایە بڵێ: ئەو ساڵە ئێسترەکەی شێخ تۆپی ئەو ساڵە باوکم مرد؛ ناچار بەو جۆرە ئەڵێ).

٦٤. ناسرەدین‌شا خەیاتباشییەکی ئەبێ لە تاران، ئەبێ بە ساقەی تۆ. خەیاتەکانی سنە لە مزگەوتی «پیرعومەر» پرسەی بۆ دائەنێن. کابرایەکی کورتاندروویش پەستەکێك لەبەر ئەکا و سووژنێك ئەکا بە پەستەکەکەیا و کشتەکێك ئەخاتە ئەملاوئەولای ملی و ئەچێ لە ژووری پرسەکەدا دائەنیشێ. یەکێ لە خەیاتەکان ئەمەی پێ ناخۆش ئەبێ پێی ئەڵێ: هەستە بچۆرە دەرەوە. ئەویش ئەڵێ: «بنیشم بە سەکینەخانمی ژنتەوە! بوچە ئێمەگەل ئەهلی تەقەڵ نین؟».

---

[١. ئەسڵی زمانە هەورامییەکە بەم جۆرەیە: «سەدەقەت بوو، ئا ساڵە هەسەرەکێ شێخی بە ڕەحمەتو خوای شییە، تاتەم تۆپا!». هەڵەگر].

٦٥. ئەم دوو قسەیە لە مەلا حەمەمینی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای مەریوانم وەرگرت: ئەوڕەحمانی خامە لە سولەیمانی یەکێك ئەبینێ هەر پەلاماری ئەدا دەست ئەکاتە ملی و ماچی ئەکاتەوە و ئەڵێ: «بەقوربانت بم! سێ ڕۆژە لەسەر ئەم چەقی ڕێگایە ڕاوەستاوم، یەکێکی خەڵکی سولەیمانیم بەرچاو ناکەوێ. وا ئێستە تۆ لە جێگای هەموو کەسەکانمی».

٦٦. وەکوو وترا شاری سولەیمانی ڕابواردنی سەیر سەیری تێدا بووە. خانەقای مەحوی بە حەوز و باخەکەیەوە، بە شۆخوشەنگی لە مەلا ئەسعەد بەولاوە، بەو تەبیعەتی ڕابواردن و دڵتەڕییە کە لەو خانەقایەدا بووە سەردەمی ڕۆژێك لە ڕۆژانی ڕابواردوو دێنێتەوە بیر. هەر شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: لە زەمانی مەلا خالددا لە خانەقا لە لێواری حەوزەکەوە بەڕە و شتە ڕائەخرێ و دائەنیشن. لەوبەری حەوزەکەشەوە سەماوەر تێ خراوە و چا ساز کراوە. ئیستکانە چا ئەخەنە سەر سینی پاڵی پێوە ئەنێ بە سەر ئاوەکەدا دێت بۆ ئەمبەر بۆلای مەلاکان. کوتوپڕ لەو کاتەدا کە سینییەکە بەسەر ئاوەکەوەیە مارێك لەناو حەوزەکە سەر دێنێتە دەرەوە. شێخ بابە عەلی ئەڵێ: ئای بریا لەم وەختەدا مشکێك هەبووایە بمانخستایەتە ناو ئەم حەوزە بمانزانیایە لەگەڵ ئەم مارەدا چی ئەکەن؟.

مەلا زوبەیری باوکی مەلا ساڵحیش لەوێ ئەبێ ـ کە ئەم مەلا زوبەیرە باپیری ئەم مەلا قادری بانگبێژی ئێستەی خانەقای حاجی مەلا عەلی بووە و منی لێ بووبووم بە خدری زیندە ـ دەست ئەبا قوتووە جگەرەکەی دەردێنێ و ئەڵێ: دەسا قوربان من هەموو وەختێ مشکێکی ئیحتیاتیم

پێیە. قوتوو ئەکاتەوە مشك فرتە ئەکا و ئەکەوێتە سەر ئاوەکە ئەمجا مار و مشك لەو ناو ئاوەدا ئەیکەن بە شڵپ و هۆڕ و سینی و ئیستکان و چا بەو ناوەدا بڵاوەی لێ ئەکەن و ئەبێ بە سەیر.

٦٧. مەلا محەمەدی مەلا مستەفای کورد گێڕایەوە وتی: لە سەردەمی حوکوومەتی عوسمانیدا شێخێك هەبوو لە «چنارە»، قەرزاری حوکوومەتێ بوو، کردبوویانە سەری و بە تەنگیان هێنابوو. ئەویش هانای بردە بەر حەمەپاشا و مەفرەزە بە شوێنیەوە. سەد لیرەی لە پاشا سەند بە قەرز و دای بە مەفرەزەکە و ڕزگاری بوو. ئەم قەرزەی دوا خست و هەر نەیهێنایەوە، پاشا کردیە سەری وتی: «برا وە سەڵەف هانێ وە ڕەوت بێریەوە». شێخە هەر گوێ نەدایە و نەیهێنایەوە، لە ئەنجاما پاشا ناردی گرتیان و هێنایان لە ژوورێکی تەنیشت ژوورەکەی خۆیا حەپسی کرد.

پاشا شەوێ لەگەڵ خێزانەکەیا دەستیان کرد بە گەمەوگاڵتە کردن، نای بە ناوکیەوە وتی: «ئێژی کونی کەم؟» شێخە لەو دیوەوە گوێی لێ بوو بانگی کرد: «قوربان تازەکەی بۆ خۆت و کۆنەکەی بۆ من». پاشا وتی: «قوڕ وەسەر ئەقڵت تۆ بۆ خۆت لەوێ هەر لە ورگی خۆت بدە». ئیتر نازانم لە ئاخرا سەد لیرەکەی لێ سەندەوە یا نەیسەندەوە.

٦٨. ژنێك هەبوو لە کەرکووك لە «بەرتەکیە»، میمکە حەنیفی ناو بوو، زۆر پیر و پەرپووت بوو. بەم و بەو ئەژیا، لێیان ئەپرسی: میمکە حەنیف عومرت؟ ئەیوت: «بە قوربانتان بم پێنج حەو ساران».

٦٩. کابرایەکی «کەماڵە»یی ئەچێتە سولەیمانی شەوێ لە ماڵی خانەخوێکەیا فرنی بۆ دائەنێن؛ کابرا بە ماستی تێ ئەگا، قەت شتی وای نەدیبو. فرنیش تازە تێکراوە زۆر گەرم بوو، ئەینێ بە سەرەوە هەر

لەناو دەمیەوە تا هەناوی هەموو ئەسووتێ لە ڕوویشی هەڵنایە دەنگ بکا. ئەو شەوە هەر جینگڵ ئەدا، بەیانی ئەچێتەوە کە ئەگاتەوە ناو خێڵ و کوڕ و کاڵ دەوری لێ ئەدەن و خەبەری شاری لێ ئەپرسن، ئەویش ئەڵێ: «برا هیچ لە شار نییە بەڵام چشتێکی چەرمگ هەس، ئەگەر چاوتان پێکەوت دوو بست بەوری وەسەرەوە بوو بڕوای پێ مەکەن. ئەو دەویت باوکە مێیە و چووگەسە پێستی گورگەوە پیاو ئەسووتێنێ».

٧٠. ها، تازە ئینگلیز هاتبوونە عێراقەوە، زۆری پێنەچوو ئەیانویست «مەلیك فەیسەڵ»ـی یەکەم ببێ بە پادشای عێراق. بۆ ئەم ئیشە بیروڕای مەردمیان ئەویست و داوایان ئەکرد. ئینگلیزییەکی زل هەبوو لە کەرکووك کردیە سەر خەڵکی وڵات کە لەم ڕووەوە باوەڕی خۆیان دەربڕن: ئایا مەلیك فەیسەڵیان ئەوێ بە شا یان نایانەوێ؟

مدیر ناحیەیەك هەبوو لە وڵاتی کەرکووك مەحموو ئەفەندیان پێ ئەوت. ئینگلیزەکە ئەویشی بانگ کرد و پێی وت: تۆش قەڵەمڕەوی وڵاتی خۆت تاقی بکەوە. مەحموو ئەفەندی چوو پرس و ڕای هێنا و گەڕایەوە.

ئینگلیزەکە لێی پرسی: ها، چۆن هاتوویتەوە؟ وتی: «قوربان ئەیانەوێ». ئینگلیزەکە چاوێکی زیت کردەوە و وتی: ـ وەکوو بە سەرسامییەوە ـ «ئەویانەوێ؟» مەحموو ئەفەندی کە سەیری چاوی کرد خێرا وتی: «قوربان نایانەوێ». ئینگلیزەکە دیسان چاوی زیت کردەوە و وەکوو بە تووڕەییەوە وتی: «نایانەوێ؟» مەحموو ئەفەندی وتی: «قوربان ئەیانەوێ». چەند جارێك ئەم ئەیانەوێ و نایانەوێیە هاتوچۆی کرد لە بەینیانا. مەحموو ئەفەندی سەیری کرد ئەمە کەڵك ناگرێ. لە پێشترا دوو مەزبەتی دروست کردبوو یەکێ ئەیانەوێ، یەکێ نایانەوێ. نایانەوێ

لە گیرفانیا بوو ئەیانەوێ لە مستیا بوو، هەردووکی دەرهێنا خستیە بەر دەستی و پەنجەی نایە سەر ئەیانەوێ وتی: «قوربان ئەمانە ئەیانەوێ»، پەنجەی خستە سەر ئەوی‌تریشیان وتی: «قوربان ئەمانەش نایانەوێ؛ جا ئیتر فەرمانی خۆتانە و لەمە زیاتر ئیتر عەزیەتی ئێمەش مەدەن». ئەڵێ: ئینگلیزەکە قاقا دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: «بەڕاستی ئیش ئەوەیە کە تۆ کردووتە و تری منت بری».

٧١. شێخ مستەفای قەرەداغی لە «مُتَصَرِّف»ی کەوتبوو خەریکی محامات بوو. ڕۆژێك لە بەغدا لە کۆڕێکا دەردەدڵ ئەکا لە ئیشی حوکمەت کە ناڕوا. مەلا حەوێزاغای کۆییش ـ ئەو سەردەمە نائیب بوو ـ لە کۆڕەکەدا بوو، ڕوو ئەکاتە شێخ مستەفا ئەڵێ: «ئاخر قوربان ئەو سەردەمە کە جەنابت موتەسەڕف بوویت لە هەولێر، ئێمەش هەر وامان ئەوت، کەچی تۆ ئەتگرتین و لە بەندیخانەت توند ئەکردین».

شێخ مستەفاش ئەڵێ: «ئێستە ئەزانم کە ئەو وەختە ئێوە ڕاستتان ئەکرد».

٧٢. کابرایەکی ئەو خۆشناوە بارێ گۆزە و دێزە بار ئەکا و ئەیهێنێ بۆ هەولێر. لە قەراخ شار کابرایەکی باجگیری تووش ئەبێ و دارێك بە هەموو هێزی خۆی ئەدا بە لای بارەکەدا نیوەی ئەشکێنێ و ئەڵێ: «ئەم بارەت چییە؟» کابرای خۆشناویش ئەڵێ: «ئەگەر دارێکی‌تری پیا کێشی هیچ!».

٧٣. مجەورێك لە «دێلێژە» هەبوو «مام ڕەسوول»ـی ناو بوو، شەوێك لە مزگەوت مەولوودی کرابوو هەموو دێلێژەیی کۆ ببوونەوە. گەورە و بچووك هەرکە هەڵئەستا ئەیوت: توخوا مام ڕەسوول ڕەحمەت لە باوکت تۆزێ ئاوم بدەرێ، مام ڕەسوول ئەوەندە هەستا و

دانیشتبووەوە، بە جارێ پەکی کەوتبوو. ئەمجا هەرکە بیوتایە مام ڕەسوول ڕەحمەت لە باوکت تۆزێ ئاوم بدەرێ. ئەیوت: «لەعنەت لە باوکم و ئاوت نادەمێ!».

٧٤. مەلا کەریمی بیارە گێڕایەوە وتی: ئەوا لە سولەیمانی لە مزگەوتی بابەعەلیدا کۆڕێکین لە مەلاکانی بناری هەڵەبجە دانیشتووین. ئەوەندەمان زانی کابرایەکی ڕووتەڵە لە دوورەوە هات ڕووی کردە کۆڕەکە. شێخ نووری بابەعەلی وتی بە مەلاکانی بەری هەڵەبجە و بیارە: ئێوە هەر ئەڵێن ئێمە بە هۆی شێخانی بیارە و تەوێڵەوە لە کەشف و کەڕامەت تۆزێ تێگەیشتووین، ئێستە من نە لەو شێخانەم و نە هیچ لەگەڵ ئەوەدا کەڕامەتێکیشتان بۆ ئەنوێنم. وتی وتمان: چۆن؟ وتی: ئەم پیاوە وا لە دوورەوە دەرکەوت تەڵاقی کەوتووە و تەڵاقەکەشی چاك نابێتەوە.

وتی: کابرا گەیشتە جێ و ڕووی کردە شێخ نووری، وتی: قوربان تەڵاقم خواردووە و هاتووم بۆم چاك کەیتەوە. وتی: وتووتە چی؟ وتی: وتم: هەر سێ تەڵاقم کەوتبێ و بە هیچ شێخ و مەلایەك چاك نەبێتەوە. شێخ نووری وتی: باوکم تەڵاقت هیچی بەسەر هیچەوە نەماوە، وەکوو خۆت وتووتە بە هیچ شێخ و مەلایەك چاك نابێتەوە. کابرا بە هەناسەساردی هەستا لێی دا ڕۆیشت. وتی: لە پاشا پرسیمان: شێخ نووری ئەوا بە کەشف و کەڕامەت زانیت ئەم کابرایە تەڵاقی کەوتووە، ئەی بە چیدا زانیت چاك نابێتەوە؟ وتی: «کەواکەی شڕ و تیلمە تیلمە بوو!».

٧٥. مەلا حەمەمینە شێتە هەبوو وەختی خۆی لە سولەیمانی لە خانەقای مەولانا ژوورێکیان دابوویە لەوێ ئەنووست. ژوورەکە قاپی نەبوو. حاجی فەقێ پێی ئەڵێ: قاپییەکی بۆ دروست کەن من

پارەکەی ئەدەم. مەلا حەمەمین ئەمەی زۆر پێخۆش ئەبێ، هەر خێرا ئەچێ بۆ لای وەستا کەریمی دارتاش بۆ ئەوە قاپی بۆ دروست کا. وەستا کەریمیش ئەڵێ: جا مەلا تۆ ئەندازەت نەهێناوە من چۆن قاپییت بۆ دروست کەم؟

مەلا حەمەمینیش ئەڵێ: هەر ئێستا ئەچم ئەندازەکەت بۆ دێنم. ئەچێتەوە هەرچەند ئەکا نازانێ ئەندازەی ئەم دەرگایە چۆن بگرێ، ئەکەوێتە بیری کە بە باڵی خۆی ئەندازەکە بگرێ. هەردوو باڵی ڕەپ ئەکا بەو جۆرە ئەندازەکە ئەگرێ و ئەگەڕێتەوە بۆلای وەستا کەریم.

لە ڕێگادا ئەکەوێتە چاڵێکەوە دەست ئەکا بە هاوار هاوار، پێ ئەزانن. یەکێك ئەیەوێ دەری بێنێ بە تەمایە بنەوێ لە پەلی ئەڵێ: «کورە نەکەی، بنەوە لە ڕیشم با ئەندازەکەم لێ تێك نەچێ!».

٧٦. مستەفا نەریمان گێڕایەوە وتی: ساڵێك لەو گوێ سیروانە شوانێك لەوبەر ئاوەکە شوانێکی جافی بەرچاو ئەکەوێ. بانگ ئەکا: هۆ هۆ شوان. ئەمیش ئەڵێ: هۆ. ئەویتر لە بوارەکەوە بۆی دێتە ئەمبەرەوە ئەڵێ: کوڕە شوانە تۆ نازانی من تاهای حەمەجانم چۆن ئێژی هۆ؟ وە کەلام ئێستە وەم تفەنگە ئەتکوژم. ئەویش ئەڵێ: برا کوشتنی گەرەك نییە، بچۆرەوە ئەوبەر بانگ کە هۆ شوان، منیش ئێژم: «هۆ بەڵێ، هۆ بەڵێ ئیتر کوچکت لێ نەوارێ بۆچی ئەمکوژی؟».

٧٧. ئەحەی کرنوو هەموومان ئەیناسین کە چۆن بووە. جارێك لەو شارەزوورە ژنێك مناڵێکی پێ ئەبێ هەر ئەگریێ و ژیر نابێتەوە. ئەحەی کرنوو لەوێ ئەبێ پێی ئەڵێ: توخوا خاڵەگیان ئەم مناڵەم بۆ بترسێنە بەڵکوو ژیر بێتەوە. خاڵە ئەحمەدیش چاوی قیچ

ئەکاتەوە و ڕوو ئەکاتە مناڵەکە ئەڵێ: «خوو لە قوزی دایکت بەم!». ژنە ئەڵێ: ئەی بێ‌فەڕ! خاڵە بۆچی من وام وت؟ خاڵە حەمەدیش ئەڵێ: دایکم بۆچی من مەیموونم، مناڵەکەت بۆ بترسێنم؟ مناڵێ کە من بیترسێنم هەر ئەبێ وای بترسێنم، پێی ڕازی نابی ئەیکەمەوە بە شوێنی خۆیا.

٧٨. کابرایەك لەو بەر کێوە ژنێکی هێنابوو. ژنە لە پاش سێ مانگ خولامێکی تۆی بوو. پیاوە سەری سڕ ما، وتی: ئافرەت ئەمە چییە؟ ژنە وتی: پیاوەکە هیچی تێدا نییە، وەرە تا حسابت بۆ بکەم. پیاوە وتی: بەڵێ؟ ژنە وتی: ئەمە سێ مانگە شووم کردووە بە تۆ، بڵێ: بەڵێ. وتی: بەڵێ. ئەمەش سێ مانگە سکم پڕە، بڵێ: بەڵێ. ئەمە نۆ مانگەکە. پیاوە وتی: وەڵڵا ئافرەت هیچ عەقڵم بەم وردە حسابە نەشکاوە!.

٧٩. پیاوێك هەبوو «مەلا مووسێ» و ژنێکی هەبوو «خاخەجیجی» ناو بوو. مەلا مووسێ چووبوو بۆ کاروان. لە پاش ماوەیەك کاغەزێکی بۆ خاخەجیجی خێزانی نووسی کە: بەم زوانە ئەگەڕێمەوە، بەر و بەرماڵ پاك کاتەوە. خاخەجیجیش وەڵامی نامەکەی بەم جۆرە بۆ ناردەوە:

بڵێـن بـە مـەلا مووسـێ
ئـەو بەر و بـەردەرگا ئەو لێی ئەپرسـێ
کردوومە بەو کاغەزە ئەو لێی ئەنووسـێ
تـا زووە بێتـەوە هیـچ لێـی نەترسـێ

٨٠. پیاوێ هەبوو لەو شارەزوورە مارفی ناو بوو، هەر خەریکی گاو گۆتاڵ بوو. برایەکی هەبوو سەمینی ناو بوو. ئەم مارفە هەموو جار خەڵکی ئەترسان بە براکەی کەوا پیاوماقوولی ماڵی شێخە. ڕۆژێك پێیان وت: ئەرێ مارف سەمینی برات ئیشی چییە و بە چ جۆر

لە ماڵی شێخدایە؟ وتی: «خزمی خەزووری سەپانی لەتکە هەرمێی ماڵی شێخییە».

٨١. کابرایەکی مایندۆڵی خۆی و کچەکەی و ژنەکەی زستان ئەبێ لەبەر بەفر و سەرماوسۆڵە ئەخزێنە ژوورەوە. ڕۆژێك ئاگریان کردبووەوە مەنجەڵێ برویشی لەسەر بوو بە دەوریا دانیشتبوون. کچە مای برویشەکەی ئەهێنایەوە کوتوپڕ پرشێك برویش کەوتە سەر گۆنای کچە و زۆر عەزیەتی دا، وتی: «ئەی گووم تێکردی». باوکەکە دانیشتبوو هەڵیدایەوە وتی: «ئەی کێری کەرم بە قوزتا با، خۆ چێشتەکەت پیس کرد». دایکەکەش ڕووی کردە مێردەکەی وتی: «گووم کرد بە ڕیشتا ئەوە بۆچ قوزی کچەکەمت دڕی؟» وەڵڵا لەسەر ئەمە ماڵ تێك چوو، ژڵەژە کەوتە ئاوایی.

٨٢. مەلا حەمەمینە شێتە لە سولەیمانی جارێك کوڕوکاڵ هەڵیئەخرێنن و ئەیبەن بۆ کانی دۆمان. کە ئەگەنە ئەوێ ئەیانەوێ کەوشەکانی لێ بدزن بۆ ئەوە لەم ڕووەوە بەڵکوو سەیرانێکیان بۆ دروست ببێ. دارێك لەوێ ئەبێ ئەڵێن: کێ ئەتوانێ بچێتە سەر ئەم دارە؟ خەڵکەکە یەکە یەکە ئەڵێن: وەڵڵا کەس ناتوانێ. ئەمانەش مەبەستیان ئەوەیە کە بەڵکوو مەلا حەمەمین بڵێ من ئەتوانم، ئەمجا بینێرنە سەر دارەکە و کەوشەکانی لێ بدزن.

سەرە دێتە سەر مەلا حەمەمین ئەڵێ: دەسا وەڵڵا من ئەتوانم. ئەڵێن: دە یاڵڵا. ئەویش چاکی ئەکا بە لادا و کەوشەکانی دائەکەنێ و ئەیکا بە بەر پشتێنەکەیا و بە دارەکەدا هەڵئەزنێ. ئەڵێن: ئەوە کەوشەکانت بۆ کوێ ئەبەی؟ ئەڵێ: «ئاخر نەوەك لەوێ ڕێگایەکم دەست کەوێ بۆ

خانەقای مەولانا هەر لەوێ کەوشەکانم بکەمە پێم بڕۆمەوە ئیتر بۆچ بێمەوە خوارەوە».

٨٣. کابرایەك هەبوو لەو سەرشیوە مام وسووی ناو بوو. زۆر پیر و ئیفتادە بووبوو. ژنێکی جوانی هەبوو عەنبەری ناو بوو. ڕۆژێك مانگی ڕەشەمێ بوو، مام وسوو سەیری کرد دوو پشیلە خەریکی گەمەوگاڵتەن؛ ئەمیش بایەکی تێکەوت، بانگی کرد: عەنبەر، عەنبەر خێرا وەرە. تا عەنبەر هات و خۆی ساز کرد مام وسوو بایەکەی نیشتەوە، وتی: «عەنبەر هەڵیگرە بۆ مانگی ڕەشەمێی ساڵی دوایی».

٨٤. حەمەبەگی حاجی ڕەسووڵبەگ گێڕایەوە وتی: کابرایەك لە «تاریەر» هەموو ساڵێ کە عێل ئەڕوا بۆ کوێستان یا ئەگەڕێتەوە، لەناو دار و دەوەنەکانا خۆی دائەگرت «جوانوو» و شتی لێ ئەدزین. ڕۆژێك خێڵ ئەڕوا و هەرچەندە ئەکا دەرفەتی دەست ناکەوێ شتێك بدزێ، ئەیەوێ بگەڕێتەوە، سەیر ئەکا وا لە دوای خێڵەکەوە پیرێژنێکی زۆر پیر گۆچانێکی بە دەستەوەیە و هات. کابرای دزە ئەڵێ: خۆ من هیچم دەست نەکەوت با سەیرێ بکەم بۆ خۆم.

ئەچێ لە پشتەوە ئەڵێ «خوو»، لەگەڵ خوو کردن پیرێژن لە سەر گازی پشت ئەکەوێ و هیچ هەڵناسێتەوە. هەتیوەکە ئەڵێ: وا چاکە بیگێم. ئەیگێ و لە پاشا لێی ئەپرسێ: میمکە ئەوە ترسای؟ ئەڵێ: ئەرێ بەخوا.

کابرا وتی: ساڵی دوایی هەر لەو وەختەدا چوومەوە بۆ تاریەر تێفکریم پیرێژنەکە گۆچانێکی بە دەستەوەیە و بەناو دەوەنەکانا ئەسووڕێتەوە ئەڵێ: «خووخووکەرەکەی پار، بم وە قوروانت بێرەوە، بێرەوە میمکی خۆت بترسێنەرەوە».

◈◇◈

# ڕشتەی مرواری

٨٥. ژنێکی هەورامی هەبوو «ئاتە»ی ناو بوو، هاتە سەرو کاری مردن و گیانەڵا. کوڕێکی مەلای هەبوو چووە سەری و دەستی کرد بە ئامۆژگاری کردنی و پێی وت: دایە ئاگات لە خوا بێ. دایکەکەش پێی وت: «ڕۆڵە مە حەدم چێشەن ئاگام جە وێ بۆ، پاسە ئای ئاگاش جە من بۆ».

٨٦. ئەحەی جاو هەبوو لە سولەیمانی پیاوێکی فەقیرۆکە و دەنگ باریکێك بوو، حەڵوای لەناو تەبەقا ئەگێڕا و ئەیفرۆشت. هیچ عەزیەتی خۆیشی نەئەدا، بە شێنەیی و لە سەرخۆ ئەچوو بە ڕێگەدا و لە ژێر لێوەوە بانگی ئەکرد حەڵوای نایاب.

ڕۆژێ پیاوێکی خەڵکی ئەو دەشتی دزەییە ڕێی ئەکەوێتە سولەیمانی سواری ئەسپێك ئەبێ و بە تەنیشت ئەحەی جاوا تێ‌ئەپەڕێ. ئەحەی جاویش لەسەر کۆڵانێك دانیشتووە لەبەر خۆیەوە حەڵوا ئەفرۆشی. کابرای دزەیی هەر بە سەر ئەسپەکەوە بانگی لێ ئەکا: کە بابی نیو ڕووپیە حەڵوای بداتێ. ئەحەش وردە وردە لەسەر خۆی ئەبزوێتەوە و هەر خنەخن ئەکا کابرا ئەڵێ: «کورە ڕابە ڕابە».

ئەحەی جاو لەمە تووڕە ئەبێ، چونکە بە شێوەی سولەیمانی ڕابە ناوە بۆ ڕابیعە، لای وایە ئەمە بە ناوەوە گاڵتەی پێ ئەکا، پێی ئەڵێ: «کورە خۆت ڕابە، دایکت ڕابە، باوکت ڕابە». پاشان ئەحەی جاو تێ‌ئەگەیەنن

کە ئەمە مەبەستی ئەوە نییە، مەبەستی ئەوەیە کە یانیٚ زوو کە. ئەحەش لەبەر خۆیەوە ئەڵیٚ: «جا بۆ ناڵیٚ: خێراکە؟!».

**٨٧.** کابرایەك هەبوو لە «کویسنجق» کەریمە گەوجیان پیٚ ئەوت. ئەم کەریمە گەوجە کوڕی حاجی مەلا ئەمینی کۆیی بوو. خەڵکوخوا سەریان ئەخستە سەری ئەیانوت: کەریمە گەوج دنیا کیٚ ئەیخوا؟ ئەیوت: «کیٚ ئەیخوا! زمان لووسان، تاس و لووسان بیٚناموسان!».

**٨٨.** کابرایەك هەبوو لە سولەیمانی عەبەشێتیان پیٚ ئەوت. شێخ عومەری قەرەداغی -کە بە «ابن القرداغی» بەناوبانگ بوو- هەموو جار پێی ئەوت: «عەبەشێت دوعای خێرم بۆ بکە». ئەویش ئەیوت: «یا شێخ هەروەخت باست بکەن ئەکەویتەوە بیرم».

**٨٩.** حاجی مەلای جوانڕۆ ئەچیٚ بۆ ئەو دەشتی شیروانەیە و فەقێیەکی «تاڵش»ی لەگەڵ ئەبیٚ. لەو دەشتە تووشی شوانێکی جاف ئەبن. حاجی مەلا سەیر ئەکا ئەوا شوانە گاڵۆکێکی بە دەستەوەیە و کەڕەکێکی خستۆتە لاشانی، ڕیشی ماش و برنج بووە. بانگی لیٚ ئەکا: ئەریٚ لالۆی شوانە لە کەیەوە شوانی؟ ئەویش ئەڵیٚ: مەلا، ئەوەتی خۆمم ناسیگە هەر شوانم. حاجی مەلا بە فەقیەکە ئەڵیٚ: ئێستە ئەم شوانە تاقی ئەکەمەوە، چونکە ئەمە قەت ئاوەدانی نەدیوە. ئەڵیٚ: «لالۆی شوانە بە چییا ئەزانی خوا یەکە و دوو نییە؟ من ئەڵێم دووە!» شوانەش ئەڵیٚ: «مەلا، من لە باوکمم بیستگە وتگیە خوا یەکە. باوکم لە باپیرمی بیستگە وتگیە خوا یەکە. باپیریشم لە باپیرە گەورەم هەر وەو جۆرە، ئێستە وە کەلام خوا ئەگەر تۆ بێژی دووە دەکەمە ملت وەم گاڵۆکە، سەرت وەك

نێرکە تەشی لەو ناوەدا خول ئەخوا، ئیتر بیوڕەوە».

حاجی مەلا وتی: کە ئەمەم بیست دەستم کردە ملی و ناوچەوانم ماچ کرد و وتم: ئیمانی تۆ لە هی من قایمترە.

٩٠. سولەیمانی حەمەجانی ڕوغزایی کچێکی شۆخوشەنگی هەبوو زۆر کەس داوایان کردبوو نەیدابوو. لەوانەبوو ناوبانگی دەرکردبوو کە سلێمان ئەم کچەی نادا بە شوو، چونکە هەرکە ئەچووە خوازبێنی هەروا ئەگەڕایەوە دواوە. ڕۆژێـك دەستەیەك لە کوێخای جـاف لە گەرمیانەوە ئەچن بۆ خوازبێنی کچە بۆ یەکێ لە کوڕەکانی حاجی قادری ڕوغزایی، کە لە دایکەوە خزمایەتیان هەبوو لەگەڵ سلێمان خانا. ڕێ ئەکەون، ئەم ڕێکەوتنەش ناوێکی دەرکرد کە چۆن سلێمان خان لەگەڵ ئەمانەدا ڕێ‌کەوتووە؟ شوانێکی ماڵی سلێمان خان هەبوو لەو وەختەدا ئەویش لە دیواخان بوو لێیان پرسی: ئەرێ برا ئەمانە چۆن هاتن، چۆن لەگەڵ سلێمان خان ڕێ‌کەوتن؟ وتی: «بەخوا نازانم، هەر ئەوەندە ئەزانم هاتن دانیشتن و قسەیان کرد و هەستان».

٩١. لە دەوری شێخ ڕەزادا لە کۆڕێکا باسی قسەی کورتی پڕ مەعنا و شیعری جوان ئەکرا، وتیان: ئەم شیعرەی فردەوسی کە ئەڵێ:

**پی مشورت مجلس آراستند    نشستند و گفتند و برخاستند**

زۆر جوان و کورت و پڕ مەعنایە. شێخ ڕەزاش وتی: وا نییە، من لەوە کورتتر و جوانتر و پڕ مەعناترم وتووە. وتیان: کامەیە؟ وتی:

**موختەسەر خۆشە قسە، بردمە مەنزڵگەهی خۆم**
**گرتم و خستم و لێم برد و گونم کرد بە چوار**

٩٢. لە زەمانی «امان الله خان والی»ـدا لە سنە پیاوێکی «ڕەمشت»ـی ئەچێتە لای پێی ئەڵێ: «قوربان بەراوی ئاورێز لە ڕەمشتا هی منە و ئێستە میرزا حەمەعەلی‌خانی زاوتی ئێوە ئیمساڵ لێی داگیر کردم. هاتووم ئەم شکاتەت لا ئەکەم». والیش ئەڵێ: لە کەیەوە ئەو زەوییە بە دەستەوەیە؟ ئەڵێ: قوربان هەشتا ساڵێك ئەبێ بە دەست ئێمەوەیە. ئەڵێ: باشە هەشتا ساڵە بە دەست ئێوەوەیە با ساڵێکیش بە دەست زاوتەکەی ئێمەوە بێت!.

ئەڵێ: قوربان کەواتە ئەم ماڵ و سامانەی ئێوەش کە چەند ساڵە بە دەست ئێوەوەیە با ساڵێکیش هەموو بۆ میرزا حەمەعەلی بێ. والی ئەڵێ: ئەم کابرایە بکەنە دەرەوە و لێی دەن. کابرا ئەڵێ: «بە دەردێکەوە هاتم بە دوو دەردەوە دەرچووم». والی ئەڵێ: بیگێڕنەوە. ئەمجا فەرمانی دا کە زەوییەکەی پێ بدەنەوە و کردیشی بە پیاوماقووڵی خۆی.

٩٣. کابرایەکی بڵباس هەبوو عەمەدی وەتمانی ناو بوو، لێیان پرسی: ئەرێ مام عەمەد مام بایز لەلایەن دین و دیانەتەوە چۆن پیاوێکە؟ وتی: «بەخودای، بابم خودای لێم هەڵناگرێ دیومە ڕۆژووان بخوا، بەڵام نەمدیوە نوێژان بکا!)».

٩٤. ئەمە یەکێکە لە عیبارەتی کوردی:

**کا چـــــوو مــــــا دانــــــی ئادەی بزانم چۆنی ئەزانی؟**

٩٥. پیرێژنێك لەو وڵاتی قەندیلە مانگایەکی هەبوو. ساڵێك بەفرێکی زۆر باریبوو، قەندیلی داپۆشیبوو. هیچ ڕەشایی بە دەرەوە نەبوو. پیرێژنە لەبەر بێ ئالیکی بۆ مانگاکەی حاڵی شڕ بوو؛ جا ئەیوت: «خوڵایا بە سەدەقەی حومرێت بم کێوی قەندیلێ بکەی بە کا

و مانگا لۆکێم سەری ڕۆ تێکا بەڵام بەخوڵای نایکەی بە قوربانت بم خوڵای».

٩٦. حەمەی لاوە هەبوو ئەیوت: «غەیبەت دێت قورگت ئەگرێ، ئەگەر نەیکەی ئەتخنکێنێت».

٩٧. [ئەڵێن]:

**خاران خوارزا مەزن کردن**

**مامان برازا بزر کردن**

واتە: خاڵەکان خوشکەزاکانی خۆیان زل کرد و بە گەورەیان کردن. مامەکان برازاکانی خۆیان ون کردن.

٩٨. پیاوێکم لابوو مام پیرداودمان پێ ئەوت. لە هەموو ڕوویەکەوە بەڕاستی پیاوێکی سادە و ئەرامەندە بوو. ڕۆژێك لە قەوسی پاییزا دانیشتبووین باسی ڕۆژ کورتی ئەکرد کە چۆن هیچی نەماوە، بە جارێ کورت بووەتەوە. هەریەکە لەم ڕووەوە قسەیەکی ئەکرد، وتم: ها مام پیرداود تۆ چی ئەڵێی؟ وتی: قوربان چی بڵێم؟ من هەر ئەوەندە ئەزانم هەر دەبێتە ڕۆژ، شەو دادێت.

بەڕاستی من وا چووە دڵمەوە کە کەم وەسفی وا کورتی پڕ مەعنا کراوە.

٩٩. بارامبەگی ئەحمەدبەگی جاف وتی: چوومە سنە؛ چوومە لای ئایەتوڵڵا سەیرم کرد پشیلەیەکی تیسکنی زۆر جوانی کەللەزلی لەلا بوو بە ئەندازەی دوو پشیلە هەبوو. لە بەردەمیا هەڵتووتابوو بە بست لێی جودا نەئەبووەوە. وتی: قوربان من پشیلەی وا گەورە و کەللەزلم نەدیوە. ئەویش وتی: «بەڵێ بارامبەگ کتکی ئایەتوڵڵا ئەشێ ئایەتوڵڵای کتك گەل بێ».

١٠٠. لە گۆڕستانەکەی سەرگەت لەسەر کێلێك ئەم هۆنراوەیە نووسراوە:

ئەگەر مەزانــی ئی بە چێش مەردەن
نازەو ناخوونیــش ئاوجزش کەردەن

١٠١. کابرایەکی کرمانجی ئەو دەشتی هەولێرە لە خزمێکی خۆی ئەپرسێ: چ کەست لا هەیە؟ وتی: «کاکە و کاك نەبی، نەبیەپۆزە و پۆز بەراوە، غەزاییە و کامراوە، مندارەکانیشم لە دەورەیان وەستاوە».

١٠٢. پیاوێکی خۆشناو دنیا زستان بوو، هەر باران بوو؛ شەوێ چووە دەرەوە و هاتەوە، یەکێك لێی پرسی: عاسمان کونە؟ وتی: «وەڵڵا ئەبێ پشیلان لێستبێتیانەتەوە». (مەبەستی ئەوە بوو کە ساماڵە).

١٠٣. «عباس قُلی سُلطان» برا گەورەی فەرەجوڵڵابەگی «ئەڵمانە» بوو. ڕۆژێك هەردووکیان لەگەڵ زابتێکی ئێرانیدا ئەچنە دەرەوە بۆ گەڕان. ئەچنە سەر ئەرزێك، فەرەجوڵڵابەگ قسە بۆ عەباس قولی سوڵتان و زابتە ئێرانییەکە ئەکا ئەڵێ: «قوربان! ئی ئەرزە "مُسَطّح"ـە کە بە نەزەرو مەبارکێت یاوۆ، ئینە چەن ساڵا "لَم یَزرَع و لَم یثمر" بووە»[1].
عەباس قولی سوڵتانیش ئەڵێ: «فەرەجوڵڵا ئی فڵتە فڵتە چێشەن مەواچی! واچە: نەکاڵیان!».

١٠٤. فەرەجوڵڵا بەگی ئەڵمانە ڕۆژێـك لەگـەڵ «آغا فَیضُ‌الله دَبیرالمَمالِك» ئەچن بۆ لای عەباس قولی سوڵتان. فەرەجوڵڵابەگ

---

[١. ئەسڵی زمانە هەورامییەکە بەم جۆرەیە: «قوربان! ئی زەمینە "مُسَطّح"ـە کە بە نەزەرو مەبارکێت یاوۆ، ئینە چن ساڵێن "لَم یَزرَع و لَم یَثمر" بیەن».]

ئەیەوێ دەبیرولمەمالیك بە عەباس قولی سوڵتان بناسێنێ ئەڵێ: «قوربان ئینە ئاغا دەبیرولمەمالیکا، تەشریفش ئاوەردەن خزمەتو سوڵتانی عەرزش هەن». عەباس قولی سوڵتانیش ئەڵێ: «فەرەجوڵڵا من ئی دەبیرولمەمالیك و مەبیرولمەمالیکە مەزانۆ. وە مەزانۆ چێش مەواچی؟ واچە ئافەزێ ئامان!».

١٠٥. مەلا حسێنی مەلا قادری بیارە لە هەڵەبجە لە پیاوێکی پرسی: ئەرێ ڕەمەزانت گرت ئیمساڵ؟ ئەویش ئەڵێ: «ئەرێ، نەژیم بۆ ساڵێکی‌کە!».

١٠٦. کوڕێـك هەبوو ناوی «دوابڕاو» بـوو. لـە باوکـی تـووڕە بووبوو، هەموو جار قسـەی خراپی پێ ئەوت. باوکەکەشـی شـکاتی لەلای خەڵك ئەکرد. خەڵکەکەش بە کوڕەکەیان ئەوت: بۆچ وای لەگەڵ ئەکەی؟ باوکتە، ئەبێ خزمەتی بکەی و لەگەڵی چاك بی. ئەویش وتی: حەقی کوڕ لەسـەر باوك چییە؟ وتیان: «ناوێکی باشـی بنێ، خەتەنەی بکا، سەرەتا ژنێکی تۆزێ بنەماڵەباش بێنێ بۆ ئەوە ئەولادەکەی باش بێ. پاش ئەمانە قورئانیشی پێ بخوێنێ» کوڕەش وتی: دە هیچیەك لەمانەی لەگـەڵ مـن نەکـردووە. «ناوم دوابڕاوە، کێرم نەبـڕاوە، دایکم تێ‌هەڵدراوە، هیچیشم نەخوێندووە».

ئەمجا خەڵکەکە وتیان بە باوکەکەی: کەواتە وازی لێ بێنە.

١٠٧. «مەولوو» لە بنەڕەتا خەڵکی سـنە بوو، عەبە پیزەش خەڵکی سولەیمانی بوو. ڕۆژێك لەسەر باسی ژن قسەیان ئەگیرێتە یەك. مەولوو ئەڵێ: «بەهەشـت بۆیـە خۆشە چونکە ژنی تێدا نییە». عەبەش ئەڵێ: «کە ژن لە جەحەنم دایە جەحەنم خۆشە!».

١٠٨. جەمالی جەمیل بەگ تەمەنی لە دەوری هەشت ساڵیدا ئەبێ. حەسەن بەگی جاف وتی: لە وەختی خۆیا دەنگوباس وابوو کە «شوکری فەزلی» شاعیری هاودەورەی شێخ ڕەزا نێرەمووك بووە. ئەم جەماڵە ڕۆژێك لە سولەیمانی ئەچێتە حەمامی موفتی سەیر ئەکا شوکری فەزلیش کە شێخ ڕەزا پێی وتووە «پوورە شوکری» لە حەمامەوە پەشتەماڵێکی لە خۆیەوە ئاڵاندووە. لە بەینی پەشتەماڵەکەوە جەمال چاوی بە گەلۆگونی شوکری فەزلی ئەکەوێ، سەیر ئەکا کێری هەر بە قەد ناوکە خورمایەکە. ئەمیش مناڵ ئەبێ شتی وای بەلاوە سەیر ئەبێ کە پیاوێکی وا زەلام کێری وا بچووکی هەبێ. ئەڵێ: «ئای ئای ئەم پیاوە کێری چەندە بچووکە». هەر کە ئەم ئەمە ئەڵێ، شوکری فەزلیش جەمال ئەناسێ و بێوەستان ئەڵێ: «ڕۆڵە بۆ مناڵ گاین ئەوەندە بەسە».

١٠٩. لە «بلەسەن» مەلایەك هەبوو مەلا وەلی ناو بوو، ژنێکی هەبوو «خاخازێ»ـی ناو بوو. خاخازێ ئافرەتێکی سەر بە دەرەوە و قسەزان بوو. لە ماوەی ژیانیا مەلا وەلیش قورعانی پێ خوێندبوو. مەلا وەلیش خۆی قسەخۆش بوو. چاوێکیشی نەبوو. ڕۆژێك هەندێ فەقێ و مەلای ئەو دەورە ئەبن بە میوانیان. دیارە لە هەموو کۆڕێکا هەموو جۆرە قسەیەك ئەکرێ. لە سەری ئەو قسانەدا باسی کچ ئەکرێ کە بەلای مەزهەبی شافعییەوە چۆن؟ وە کێ ئەیدا بە مێرد؟ لەمەوە قسەی لێ ئەبێتەوە و هەریەکە ئەڵێ چ جۆرە کچێك باشە. سەرە دێتە سەر مەلا وەلی، ئەویش ئەوەی بیزانێ ئەیڵێ. خاخازێیش خەریکی ئیش و نان دروستکردنە و گوێی لە قسەکانی هەموویان ئەبێ.

کە سەرە ئەگاتە سەر مەلا وەلی مێردی لە قسەکانی ئەو زیاتر تووڕە

ئەبێ و ئیتر خۆی پێ ڕاناگیرێ. ئەڵێ: یەك چاوی بێفەڕە، کەی وا ئەبێ؟ تۆ لە هەموویان نەزانتری. کچ ئەمانەیە: «کچی دەساڵان بیلبیلەی چاوان، کچی پانزە ساڵ دەسکە گوڵێکی ئاڵ، کچی بیست ساڵی تەواو گۆشت و دوگێکە بۆ خاوەن حەساو، کچی سی ساڵان دایکی مناڵان، کچی چل ساڵان پیرێژنی ماڵان، کچی پەنجا ساڵ کوشتنیە حەڵاڵ، کچی شەست ساڵی لەعنەتی لێ بێ لە خۆی و ماڵی!». کە ئەم ئەمەی وت هەموویان ئیتر پەکیان ئەکەوێ.

١١٠. کابرایەکی «لەك» هەر خۆی هەڵئەکێشا کە پیاوێکی چاکە. ئەم لەکانەش دەستەیەکن لە ئەترافی هەولێر؛ ئەو لەکانە نین کە کەریمخانی زەند لەوانە.جا کابرایەکی کرمانجی هەولێری پێی وت: «ئەگەر چاکیت لەك نیت. ئەگەر لەکیت چاك نیت».

١١١. پیاوێك هەبوو لە سنە ئامحەمەدی ناو بوو. شەڕی فەرامیرزا و هەورامییەکان دەستی پێکرد. فەرامیرزا سەرکەوت کە مەردم بە تەمای ئەوە نەبوون. ئەویش ئەیوت: «براگەل جەنگ چەند ئەندامێکی هەس: لەشەکەی ئازاییە، دڵەکەی تەگبیر کردنە، چاوگەلی خۆ پاراستنە، باڵگەلی فەرمانبەردارییە، زوانەکەی فێڵ و تەڵەکەس، پێشڕەوەکەی نەرمی و لەسەرخۆییە، ڕانندەکەیچی سەرکەفتنە، هەرکەس ئەمانەی بوو لە جەنگا، جەنگ ئەواتەوە»[1].

[١. مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس لە کتێبی «یادی مەردان»ـدا ئەفەرمێ: هەورامییەکان «شَبیخون» ئەدەن بەسەر سوپای فەرهادمیرزادا، ئەیانشکێنن و ناچاری هەڵاتنیان ئەکەن. تەنانەت فەرهاد میرزا لە ملەی «بلچەسوورە»ەوە لەسەر هەژگ بەسەر بەفردا ڕایان کێشاوە تا لە دەست تفەنگچی هەورامی ڕزگاریان کردووە. فەرهاد میرزا خۆی باسی ئەم ڕووداوەی لە «منشآت»ـەکەیدا نووسیوە و نووسیویشیە:

١١٢. کابرایەك لەو سەرشیوی سەقزە ژنێکی هێنا و لە پاش سێ مانگ کوڕێکیان بوو. پیاوەکە لە ماڵ نەبوو، ژنەکە زەماوەندی گوێزەبانەی گێڕا. لەو وەختەدا پیاوە هاتەوە و لەم کارەساتە واقی وڕ ما وتی: ئا سەبرکەن ئەمە چییە؟ ڕووی کردە ژنەکەی و وتی: چۆن لە پاش سێ مانگ مناڵ ئەبێت؟ ژنە وتی: پیاوەکە وا نییە، تۆ نەتزانیوە وەرە تا حیسابت بۆ بکەم: «ناو جەژنان و دوای جەژنان و بەرە جەژنان ئەمە بۆ دۆ، گەلاوێژ و سەراوێژ ئەمە بۆ شۆ، مانگی چلە و دوای چلە و پێش چلە ئەمە نۆ. ئادەی تیەڵکە لۆتیچەقۆ». بەم جۆرە نۆ مانگی بۆ پڕ کردەوە.

١١٣. مەلا مارفی کۆیی لەو موکریانە سەگێکی هەبوو زۆری خۆش ئەویست، بۆ هەرکوێیەك بچوایە سەگەکەی بە شوێنەوە بوو. ئەم خۆی چی دەست کەوتایە بەشی ئەویشی ئەدا. بەکراغا هەبوو لە «قەباکەندی» ڕۆژێك پێی ئەڵێ: مامۆستا ئەم سەگەت بۆچ ئەوەندە خۆش ئەوێ؟ لەگەڵ ئەوەشا گڵاوە؟ ئەڵێ: «برام شەڕی خۆیم لێ لا ئەدا، شەڕی خەڵکم لێ دوور ئەخاتەوە، لەسەر شتێکی زۆر کەم کلکەسووتێم بۆ ئەکا، بەیانی و ئێوارە پاسەوانیم ئەکا، لەناو هەموو حەیوانێکا هەموو دەم لەگەڵمایە، لە هەموو کەس خۆشتری ئەوێم، دووزمانیم لەگەڵ ناکا، لە پاشەملە باسم ناکا».

بەکراغاش ئەڵێ: «بریا مامۆستا من ئەو سەگە بوومایە و تۆ وەسفت بکردمایە، وە یا تۆ ئەو کەسە بوویتایە کە ئەو وەسفانەی تیایە».

---

«فلَيسَ الفِرارُ اليَومَ عاراً علَى الفَتى    إذا كان مَعلوماً شـــجاعةُ أمسِـــهِ»

(یادی مەردان بەرگی٢ لاپەڕەی ٨٢ چاپخانەی بەغدا ـ ١٩٨٣). بڕوانە بابەتی ژمارە: ٧٨٧. هەڵەگر].

١١٤. سۆفی مەحموو هەبوو مجەوری خانەقای مەحوی بوو لە سولەیمانی. ڕاستی بە دەما نەئەهات. ڕۆژێك مەحوی ئەیگرێ ئەڵێ: سۆفی مەحموو تۆ قەت ڕاستت کردووە؟ ئەویش ئەڵێ: قوربان ئەگەر ئەمەم بۆ ڕاست نەژمێررێ ئەموت نەء».

١١٥. مەلا یووسف هەبوو لەو سەرشیوی سەقزە، ماشائەڵڵا زۆر زۆر ناشیرین بوو. ژنێکیشی هەبوو مەلاژن پیرۆزی ناو بوو. مەلاژن پیرۆز لە جوانی و شۆخیدا لە هەموو سەرشیوی سەقز ناوی دەرکردبوو. لەگەڵ ئەم جوانییەشیا بۆ ئازایی و شاژنی هەر بە پەنجە نیشان ئەدرا. مەلا یووسف هەر ئەوەندەی خۆش ئەویست مەگەر هەر مەلاژنپیرۆزی لەو خۆشتر ویستایە، مەلاژنپیرۆزیش هەر نەخوێندەوار بوو.

مەلاژن پیرۆزیش سەیری مەلا یووسفی مێردی ئەکا و چاوی لێ ناترووکێنێ. مەلا یووسف ئەڵێ: مەلاژن پیرۆز ئەوە بۆچ وا بە کوڵ سەیرم ئەکەی؟ مەلاژن پیرۆز ئەڵێ: «باوکی محەمەد ئەزانم خوا هەردووکمان ئەخاتە بەهەشت و لەوێشا هەر پێکەوە ئەبین». ئەڵێ: چۆن؟ بە چییا ئەزانی؟ ئەڵێ: «تۆ لەسەر شوکر کردنت بە من، منیش لەسەر سەبر کردنم بە تۆ. خوا جەزای شوکر و جەزای سەبر هەردووکی ئەداتەوە!»».

١١٦. حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادەی کۆیە ئەچێت بۆ بەغدا بە ناوبانگی موفتی زەهاوییەوە بۆ چاوپێکەوتن و زیارەتکردنی. پاش ئەم دیدەنییە ئەگەڕێتەوە بۆ کۆیە. ئەمجا خەڵك لێی ئەپرسن: «قوربان تۆ مەلاتری یا موفتی زەهاوی؟» ئەویش ئەڵێ: «هەردووکمان مەلاین، ئەوەندە هەیە من شوێن کتێب ئەکەوم، موفتی زەهاوی کتێب

شوێنی ئەو ئەکەوێ!».

١١٧. ژن مووی درێژە و ئەقڵی کورتە.
- یەکێ ژنێکی هەبوو دوژمنێکی هەیە.
- باوەڕت بە ژنەکەت هەبێ ئەگەر دایکت چاودێری بکا.

١١٨. ئەگەر هەور چوو لۆ بادینان خۆ هەڵکوتە لۆ کادینان. ئەگەر چوو لۆ شارەزوور بچۆ لۆ ڕێگەی دوور.
- ئەگەر هەور چوو بۆ بانە بچۆرە یانە. ئەگەر چوو بۆ هەورامان بچۆ بۆ کاروان.

١١٩. شێخ قادری شێخ سەعید لەگەڵ شێخ حەمەغەریبا کێشەیەکیان ئەبێ. شێخ حەمەغەریب لەسەر مڵك شکات لە شێخ قادر ئەکا. لە ژووری مەحکەمە شێخ قادر تووڕە ئەبێ لە شێخ حەمەغەریب ئەڵێ: ئێوە کەی پیاو بوون بەرانبەر بە ئێمە؟ باوك و باپیرتان هەر پیاوی ئێمە بوون وا ئێستە تۆ هاتووی بەرانبەر بە من ڕائەوەستی.
شێخ حەمەغەریب ئەڵێ: «ڕاست ئەکەی باوکم پیاوی باوکت بووە و باپیرم پیاوی باپیرت، چونکە ئەوان پیاو بوون؛ بەڵام ئێستە تۆ پیاو نیت و کەس نابێ بە پیاوت».

١٢٠. ئەوجا «سەی‌ساق» لەو شارەزوورە دۆمی تیا دائەنیشت. ئەم گوندەش هی وەسمان‌پاشای جاف بوو. وەسمان‌پاشا ڕۆژێك بە تایەربەگی کوڕی ئەڵێ بچێ سەرانە و موڵکانەی سەی‌ساق بێنێت. ئەویش ئەمەی پێ ناخۆش ئەبێ و کاتێ کە ئەیەوێ لای وەسمان‌پاشا دەرچێ ئەڵێ:

**من بە تاجی خوسرەوی و جامی جەهانبین گەپ ئەکەم**
**تۆ بە مـەئمووری سـەرانەی دۆم و خـەڕاتم ئەکـەی؟**

وەسمانپاشا کە گوێی لێ ئەبێ پێی ئەڵێ: «برا بگەڕێوە شاعیری خۆت بۆ خۆت و سەیساقی خۆم بۆ خۆم!».

١٢١. مەلا محەمەدی «بەروێن» هەبوو کە بە «مەلا قوەیسەن» ناوبانگی دەرکردبوو. دەستی شاعیری هەبوو، ئەگەڕا بە ناوی ئەو عەشرەتی قوایی و باوەجانییەدا. بچوایەتە دیواخانی هەر کوێخایەك کوێخاژن لەبەر ئەوە نەوەك مەلا قوەیسەن بە شیعر ناو و ناتۆرەیان لێ دەرێنێ خزمەتێکی زۆری ئەکرد.

ڕۆژێك ئەوا دەمەدەمی عەسرە و شەستەباران ڕەهێڵە ئەکا، ئەچێ بۆ بنکەیەکی باوەجانی. هەر لە دوورەوە لە ئاواییەوە چاویان پێ ئەکەوێ و ئەیناسن کە ئەمە مەلا قوەیسەنە. خەبەر ئەدەن بە ماڵی کوێخا کەوا مەلا قوەیسەن هات. کوێخا لە ماڵەوە نابێ، ژن لەرزی لێ دێ کە ئێستە نە نیوەڕۆیە و نە ئێوارە، هیچ حازر نییە، چۆن مەلا قوەیسەن بەڕێ کا؟ ئەگەر باشیش خزمەتی نەکا زمانەکەی شڕە لەوانەیە حەیایان بەرێت. تا ئەم خەریکی ئەم فیکر کردنەوەیە ئەبێ مەلا قوەیسەن لە دەرگای دەوارەوە سەر ئەکا بە ژوورا.

کوێخاژن ئەچێ بە پێشوازیەوە عەباکەی لێ ئەستێنێ و ئەیکا بە سنگی دەوارەکەدا. ئاگردانێ ئاگر ئەکاتەوە حەو جۆشی ئەخاتە لا و هەر بە دەوروبەری مەلادا دێ بە ماریفەت نواندن. مەلا لەوانە نییە شەوێ بمێنێتەوە. کوێخاژن ئەچێ تەشپییەکی گەورە هەنگوین دێنێ دوو چنگی چاکی کەرەی ئەخاتە سەر، لەگەڵ دەستەبەرەیەك نانی

هەورامیدا بۆی دائەنێ، پێی ئەڵێ: لە ڕێگاوە هاتووی دنیا سارد و بارانە ڕەنگبێ برسیت بێ، جارێ تۆزێ لەم هەنگوین و کەرەیە بخەرە بەر دڵت بۆ ئێوارەش خرتێك ئەکوژێنەوە. ئەشزانێ مەلا نامێنێتەوە بۆ ئێوارە؛ بەڵام ئەم هەموو ماستاوکردنە هەر بۆ ئەوەیە کە مەلا زەمیان نەکا.

مەلا لەبەر ئەوە برسی ئەبێ ئەوەندە هەنگوین و کەرە ئەخوا هەتا لە لووتی دێتەوە و هەنگوین ئەیگرێ، ڕەپ لێی ڕائەوەستێ. لە پاش ماوەیەك تۆزێ دێتەوە سەر خۆی و ئەڵێ: عەباکەم بۆ بێنە ئەڕۆم. کوێخاژن ئەڵێ: بە قوربان چۆن ئەڕۆیت؟ تۆ فەڕ و بەرەکەتت هێناوە، ئەبێ ئێمشەو لێرە بیت کوێخاش دێتەوە لە خزمەتتا ئەبێ. ئەڵێ عەباکەم بۆ بێنە ئەبێ بڕۆم ئەم شیعرەش بدە بە کوێخا:

وە تیکەی هەنگوین پەنگی چنیمۆ

ئاوی چیەیی دا وە گونێمۆ

مەعناکەی ئەوەیە ئەڵێ: «بە پاروویەك هەنگوین هەناسەی لێ بڕیم، ئاوی ساردی دا بە گونمەوە». ئەمەش ئیشارەیە بەوە مایین دێتە فاڵ، بیانەوێ ئێستری بێ نێرەکەری ئەخەنە سەر، جا ئەگەر ئەو نێرەکەرە زۆر لێی پەڕی دێنن ئاوی سارد ئەکەن بە کێر و گونیا بۆ ئەوە ئیتر لێی نەپەڕێ. وا دیاربوو کوێخاژن ئەم هەموو ماستاوەی بۆ مەلا قوەیسەن کرد هیچ کەڵکی نەبوو.

١٢٢. دەنگ وایە موفتی زەهاوی وتوویە: «نالی» ئەم هۆنراوەی بە منا وتووە:

ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر تەقویەتی سەبەب دەکا

عارفی وەحدەت ئاشنا لەم قسەیە ئەدەب ئەکا

هەروەها قسەکەی موفتی و هۆنراوەکەش جگە لە مەعناکەی خۆی، ئەوەش ئەگەیەنێ کە موفتی خێل بووە.

١٢٣. حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە بەینی لەگەڵ موفتی زەهاویدا زۆر خۆش ئەبێ. موفتی زەهاوی ناوی محەمەد و کوڕی ئەحمەدە؛ «٩٨» ساڵ ژیا. حاجی مەلا عەبدوڵڵا ئەچێ بۆ زیارەتی دۆستی کۆنی موفتی زەهاوی. لە دیوەخانی موفتیدا دائەنیشن و گەلێ لە عالمەکانی بەغدا لە دیواخانەکەدا ئەبن. حاجی مەلا دێت بە تەعریفیدا و وەسفی ئەکا. موفتیش لەولاوە دانیشتووە و سەری داخستووە. ئەمجا حاجی مەلا باسی مەسائیلی عیلمی ئەکا لەگەڵ تەعریفەکەی موفتیدا. بە موفتی زەهاوی ئەڵێن: قوربان گوێت لە قسەکانی مەلا عەبدوڵڵایە؟ موفتیش ئەڵێ: «من بۆ قسەکانی کاکەوڵا گوێم خێلە».

ئەمە گوزارشتێکە تەنها موفتی زەهاوی وتوویەتی. خێلی بۆ چاوە؛ چاو کە خێل بوو شتێك بە دوو شت ئەبینێ، ئەمیش ئەڵێ: من قسەکانی حاجی مەلا ئەوەندە خۆشن بەلامەوە هەر قسەیەکی بە دوو قسە وەرئەگرم.

١٢٤. ئاڵتوون ئەفەندی هەبوو لە گاورەکانی سولەیمانی بوو. پیاوێکی باڵابەرزی باریکەلە، کەوایەکی درێژی ئەکردە بەری، قایشێکی باریکی ئەکرد بە پشتێن، سەدارەیەکی ئەکردە سەری، دەستی ئەخستە پشتیەوە و وردە وردە لە گەڕەکی گاورانەوە ئەچوو بۆ ناو بازاڕ. لێیان ئەپرسی: ئاڵتوون ئەفەندی ئەو ئایەتە لە قورعانا کە ئەفەرمووی: ﴿فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا﴾ مەعنای چییە؟ ئەویش بەبێ وەستان ئەیوت: «یانێ هەڵمەتی برد و فڕووجەکەی گرت و قووتی دا!». ئەیانوت: ئەی ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ﴾ مەعنای چییە؟ ئەیوت: «ئالەم تەڕە، کەیفە!».

١٢٥. شێخ مستەفا تاڵەبانی هەبوو کە باسی خراپی یەکێکی بکردایە ئەیوت: «هەی هەی توڵ بێ و شڵ بێ و کوڵ بێ و لە دەرماڵی کۆڵی بێ».

١٢٦. حاجی قادری ڕوغزایی هەبوو، ساڵێك ئەچێ بۆ حەج و لە ڕێگادا سواری حوشتر ئەبێ. پاشان باسی حوشتر ئەکا ئەیگرێتەوە و ئەڵێ: کە چووم بۆ حەج لەو دەشتی عەرەبستانە غەزەوێکی خوایان هاورد و ناویان ناوو حوشتر. حوشتر، حوشتر نەوو تاوێرێك بوو؛ ملێکی پێچ و قەمچ. ئەو ساڵە چووبوومە دیواخانەکەی سەی ئەحمەدی بابە ڕەسووڵ لە سولەیمانی، شتێکیان بۆ هاوردم پێیان ئەوت «نێرگەلە»، شتێکی پێچپێچی پێوە بوو ئەتوت سوجەماری شارەزووره. لە باتی ئەوە بکیفێنێ قۆرتەقۆرتی لێوە ئەهات. ملی ئەو حوشترەش لەو مارپێچە ئەچوو. لەباتی ئەوە قۆرتەقۆرتی لێوە بێ، بۆڕەبۆڕی لێوە ئەهات. هەر ئەوەندە بەرز وو ئەتوت چوار هەسوونت خستگەسە سەر یەك. کاورایەکی گولەکەی عەرەبی لەگەڵا وو هەر لەگەڵ پێی ئەوت: «یخ»، خێرا پخی ئەکرد.

کاورا بە منی وت: بێ سوار وە. منیش چووم سواری بووم. ئەمجا کاورا پێی وتەوە: «خێی» ئەوەندەم زانی حوشتر کەوتە جووڵە، بۆڕەیەکی کرد، لمۆزی توند کرد لە زەوی، پاشەڵی بەرز کردەوە و پاشان هەردوو دەستی بە دوو جمگەوە قوت کردەوە. سەیرم کرد من کەوتمە شەکوشۆك وا خەریکم ڕووەو عاسمان ئەچم، وە قەورەکەی حەمەپاشا ئاگام لە خۆم برپیا کە حوشتر ڕاست بووەوە من لە بەینی زەوی و عاسمانا وەکوو قوتەی مل نێرگەکاردووم لێ هات. خێرا پەلامارم دا توند دەستم گرت وە کۆپانەکەیەوە.

حوشتر ملی وا درێژ، کەچی کلکی ئەتوت کلکی مارمێلکەی بڕیاگە.

ئێمە ماینە بۆرەمان هەس، دەست و قاچی هەریەکە کلاوەژنۆیەکیان هەس، کەچی ئەو دوابڕاوە وەکوو بەرچیغی شکاو لە دوو لاوە دەست و قاچی ئەشکایەوە؛ لەو سەرەوە وەکوو قەورەکەی باوە شاسوار کە وا بەسەر گردەکەوە، ئەویش شتێك وە سەر پشتیەوەوو، کاورای فیقنەی عەرەب ئەیوت: ئەمە دووگەکەیەسی. وتم: کورە کوچکی تۆی لێ نەوارێ دووگ وا لە دواوە؟ خۆ هیچ نەوێ من مەڕە پەرەکەی خۆمانم دیگە دووگەکەی وە سەر قنگیا شۆڕ بووگەسەوە، تۆ شێت بووگیت ئێژی ئەوە دووگیەسی. من فرەم وت و ئەو فرەی وت، هیچ نەچوو وە گوێچکەیا.

دوو گوێی بچکۆلەی وەکوو گوێچکە مشکی هەبوو. کاوێژی ئەکرد وەکوو گا، کەچی پشقلی ئەکرد وەکوو بزن. ئەی بەردت لێ نەوارێ بۆ دەعبای وا.

خۆ لەو سەرەوە من زیڕەم کردوو، خوا بکا ئەوی دوژمنیشتە تووشی غەزەوی وا نەوێ. بۆچ ئەموێرا جیقە بکەم!. کاورای فیقنەش هەر پێی ئەوتم: خاڵە حاجی وا نزیك بووگیتەوە لە خوا. کە چوویتە «کاوە» بە تەواوی ئەچیتە ماڵی خوا. وتم: ئۆ برا بەڵا لە خۆت و لەم نزیك بوونەوە و لە ماڵی خواتدا، ئەگەر ئەم جارە ڕزگارم بوو لەم غەزەوی خوایە و بە ساغی گەیشتمەوە ژێر دەوارەکەی دەشتی شارەزوور، جارێکی‌کە من وێت و تۆوە بکەم گووی وا نەخۆمەوە.

١٢٧. یەزیدییەکان ئەڵێن: هەژدەی ئاداری مەلەکە زین هاتە خارێ، دەنگ کرن بهارێ، هەتا بیست‌وچهارێ، سەری دارێ خەملێ، بنی دارێ کەملێ.

دیسان ئەڵێن: ژنا جوان دەردی بێ دەرمان، ن تێ کوشتن، ن تێ بەردان.

١٢٨. لە کوردەواری پیرێژنان کە بە شەو منالان ئەکەنە خەو، ئەم ڕستانەی خوارەوە بە دەوریانا ئەخوێنن و فووێك ئەکەن بە دەوریانا کە دەستی پێ ئەکەن ئەڵێن:

یا سەی سەروەر، یا خواجەی قەمەر، بەشقی سولەیمانی پێغەمبەر دەمی مار و چزووی عەقرەو بخەینە قەمەر، هەتا سبەینێ خۆری ئەکەوێتە سەر.

١٢٩. لە شەوی «مِعراج»دا ژنە سەرەکان ئەم ڕستانە ئەخوێننەوە: زەللەکە زەلیلەکە، کەمەربەستەی خەلیلەکە، ئەمشەو شەوی نوورانە، ڕەسوولەڵڵا میوانە، کلیلم دایە دەس جەبار، یا محەمەدی نازدار.

١٣٠. لەو وڵاتی شێخان و بادینانە فەلەیەکی زۆر لەوێ دانیشتبوون؛ هەموو گوندەکان هەر فەلە بوو. «مستواغا» هەبوو لەو دەوروبەری ئامێدییە. ئەم مستۆئاغایە هەموو دەستە و عەشرەتەکەی هەر ئەوە بوو کە لە گوندەکەی خۆیا بوون، فەلەکانیش زیاتر لە سەد گوندیان هەبوو. مستۆئاغا بەربەرەکانێی ئەو هەموو فەلانەی ئەکرد، هەرچەند پەلاماریان ئەدا هیچیان پێ نەئەکرا، ئەمیش کە پەلاماری ئەوانی ئەدا زیانێکی زۆری لێ ئەدان و کوشتارێکی فراوانی لێ ئەکردن. گەورەی ئەم فەلانەش «مارشەمعوون» بوو.

گەلێ ساڵ ئەم دوژمنایەتییە درێژەی کێشا، فەلە لەگەڵ مستۆئاغادا هیچیان پێ نەکرا. لە ئەنجاما مارشەمعوون وتی: ئێمە هەموو لەم وڵاتەدا دانیشتووین، ئەم شەڕ و ناکۆکییە تاکەی درێژە بکێشێ لە بەینمانا؟ چاکتر

بۆ هەردوولامان ئەوەیە ئاشتی بکەویتە بەینمانەوە. هەستا بە خۆی و سەد سوارێکی فەلەوە هات بۆ ماڵی مستۆئاغا و خزمەتێکی باش کران. لە پاش ماوەیەك والی مووسڵ ناردی بەشوێن مستۆئاغادا و پێی وت: مادام مارشەمعوون هاتووە بۆ لای تۆ و ئاشتی کەوتۆتە بەینتانەوە، من حەز ئەکەم تۆیش بچیت سەرێ لەو بدەی و منیش دێم پێکەوە ئەچین، بۆ ئەوە ئیتر ئەو دوژمنایەتییە بنەبڕ ببێ. مستۆئاغاش وتی: باشە.

ئەمانیش بە چەند سوارێکەوە لێیان دا ڕۆیشتن. کە مارشەمعوون خەبەری زانی دیواخانێکی گەورەی هەبوو ڕازاندیەوە و پێشوازیەکی باشیشی کردن. مارشەمعوون هەژدە کوڕی تفەنگ بەدەستی هەبوو، مستۆئاغا سەیری کرد هەژدە تفەنگی تەلیعە لەناو دیواخانەکەدا بە دیوارا هەڵواسراون و هەریەکە دوو قەتارە فیشەکیان بە سەرەوەیە و کوڕەکانیش لەولاوە بە ڕیزە دانیشتوون. وتی: مارشەمعوون ئەمانە ڕەنگبێ تفەنگی ئەم کوڕانە بن؟ خوا هەر زیادیان کا و عەمریان درێژ کا. مارشەمعوون وتی: «بەڵێ ئاغا، هی ئەوانە بریا هەژدە نەبوونایە و تەنها یەکێك بوونایە و یەکەکەش وەکوو تۆ بوایە».

١٣١. کاروانێکی «دەلۆ»یی لەو گەرمیانە ئەچن بەسەر سەید فەتاحی جەباریدا. کاروانەکە نۆ کەس ئەبن ئەڵێن: «سەید، ئیمشەو بە نان و دان و گانەوە میوانتین».

ئەویش ئەڵێ: «نان هەیە، دان هەیە؛ بۆ ئەوی تریش ئافرەتێکی دەلۆییمان لە ماڵایە نۆ لۆی بۆ ئێوە و لۆیەکی بۆ من».

١٣٢. چەکی ژن لە کاتی خەما فرمێسکیە؛ لە خۆ پاراستنیا قیژە قیژیە؛ لە کاتی بەزینیا بێدەنگییەتی؛ لە چەلەحانێدا پێ‌کەنینیە».

١٣٣. مەلا ئەحمەدی لاسوور لە موکریان مەلایەکی بەناوبانگ و لەگەڵ ئەوەش بەهۆی شان و قۆڵی خۆیەوە ئەژیا، هیچ ئاتاجێکی بە نانی مەلایەتی ئەو وڵاتە نەبوو.

حەریق شاعیری بەناوبانگ ڕۆژێك ئەم مەلا ئەحمەدی لاسوورە ئیشێکی پێ ئەبێ، یەکێ ئەنێرێ بۆ لای کە ئیشەکەی بۆ بکا. بانگێشتنیشی بکا بۆ لای خۆی، لە سەرەی ئەو شتانەدا کە ئەیداتێ «کاڵەك»یشی بداتێ؛ چونکە مەلای لاسوور بێستانە کاڵەکێکی نایابی هەبوو. جا کاڵەك بێت و هی موکریان بێ و مەلای لاسوور کردبێتی، ئەبێ چۆن کاڵەکێك بێت؟ بەڵام حەریق کە دێت مەلا کاڵەکەکەی ناداتێ حەریقیش ئەمەی بۆ ئەنووسێ:

مەلا وەعدەی بە کاڵەك دا شــکاندی
خەیاڵێکــی لە دڵــدا بــوو گەیاندی
ئەگــەر ئەمزانی کاری تۆیە لاســوور
بە لای ڕەشــتا بە سووکی ئەمتڕاندی



# ڕووداوەکانی ڕابوردوو

١٣٤. ساڵی (١٩٣٢) بوو، بۆ یەکەمجار ڕادیۆ هاتە شاری سولەیمانی. ئەو چاخانەیە کە پێیان ئەوت: چاخانەی «حەمەڕەق» و شوێنەکەی لەم لای ئەسحابە سپی و لەسەر بازاڕی کورتاندرووەکان بوو. جادەکەی مەڵکەندی لە سەرەوە ئەهات بە بەردەمیا و ئەچوو بۆ بازاڕ. لە دواییدا ماوەیەکیش ئەو چاخانەیە «مەجۆلی خامە»ی بە سەرەوە بوو. جا خاوەنی ئەو چاخانەیە یەکەم کەس بوو کە ڕادیۆی هێنایە شاری سولەیمانی و لە چاخانەکەی خۆیا دایناو. لەو سەردەمەدا ڕادیۆ وەیا بڵێین ئێستگەی ڕادیۆ هەر بە ئێواران ئیشی ئەکرد. هەرا کەوتە سولەیمانییەوە کە شتێك هاتووە قسە ئەکا و لە ڕواڵەتا هیچ زەلامیش نییە.

هەر لە پاش بانگی شێوانەوە پیاوانی سولەیمانی لە مەڵکەندی و سەر شەقام، کانیسکان و سابوونکەران، دەرگەزێن و گوێژەوە بۆی ئەکشان بۆ ئەو چاخانەیە بۆ سەیر کردنی ئەم مۆجزەیە کە هاتووە؛ سا کێ پیاو بوایە زووتر بچوایە جێگای خۆی بگرتایە، نە کورسی چاخانە جێ ئەبووەوە نە سەر ئەرزەکە جێ ئەبووەوە، ئێقی ئەدایەوە بۆ سەر جادەکە. دەرزیت هەڵخستایە نەئەکەوتە زەوی.

مۆجزە ئەکەوتە کار و بە زمانی عەرەبی قسەی ئەکرد. خۆ کەس لێی تێنەئەگەیشت، بەڵام دەنگێکی لێوە ئەهات. خەڵکەکە لەوە واقیان وڕ مابوو کە ئەم دەنگە چییە لەو دارە ڕەق و تەقەوە!. یەکێ ئەیوت:

زەلامە لە ناویا قسە ئەکا، یەکێ ئەیوت: ئەمە سیحر و جادووە، زۆریش لەسەر ئەوە بوون کە ئەو قسەیە «میل»ـە سوورەکە ئەیکا. ئەوە ئێستە من ئەڵێم میل، ئەگینا ئەو وەختە بە میل [ناو] نەئەبرا، بەڵکوو بە ماسی ناویان ئەبرد. ئاخر بڕیاری زۆرتری خەڵك هاتە سەر ئەوە کە ئەو دەنگە، دەنگی ئەو ماسییە سوورەیە و ئەو ماسییە قسە ئەکا. ئەگەر لە ئێمەش ئەپرسی، ئێمەمانان لەسەر جادەکەش جێگامان نەئەبووەوە.

١٣٥. ساڵی (١٩٣٤) بوو کارەبا پێنج ساڵێك بوو هاتبووە سولەیمانی بەڵام کەس ئاگای لە پانکە و مانکە نەبوو؛ بە تایبەتی ماڵان.

«حاجی مەلا عارفی بستۆ» چووبوو بۆ بەغدا پانکەیەکی «مارللی» هەژدە ئینجی هێنا بوو. ئەوە یەکەمجار بوو پانکەی مێز بێتە سولەیمانییەوە. حاجی مەلا عارف ماڵەکەیان لە ژوور خانەقای مەحوی و لە خوار مزگەوتی «خومخانە»وە بوو، با بڵێین: بەسەر جادەکەی ئەو وەختەوە.

حاجی مەلا عارف پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، خانووەکەی خانووبەرەیەکی چاك بوو. حەوشەیەکی گەورە بە خشتی سوور فەرش کراو، حەوزێك لەناو حەوشەکەدا، خانووەکە دوو نهۆم بوو. هەموو ژوورەکان کەوتبوونە باکووری حەوزەکەوە. نهۆمی خوارەوە سەر تەنوور و ژووری زەخیرە و شتە بوو. نهۆمی سەرەوەش ژووری نوستن و دانیشتن و کەلەگی بوو. بەرهەیوانێك لە بەر کەلەگییەکەدا بوو، ئەیڕوانی بەسەر حەوزەکەدا. بە چەند پێ‌پلیکانەیەك لە حەوشەکەوە ئەچووە بەرهەیوانەکە.

دنیا هاوین بوو، حاجی مەلا عارف لەسەر پایەندازی، وەیا بڵێین: لەسەر شەرەفی ئەم پانکە ناوازەیە کە ئەو هێناویە بۆ ماڵی خۆیان، بانگێشتنێکی نانخواردنی ئێوارەی کرد بۆ هەندێ لە دۆست و برادەرەکانی

بۆ ئەوە پانکەیان چاو پێبکەوێ. خۆیشی پیاوێکی دڵتەڕ و لەگەڵ دڵتەڕییەکەشیا بەدەسەڵات بوو؛ ئەوانەی کە لە بیرم مابن:

ئەحەڕەش و ڕەشەی مەلابرایم، ئەو وەختە حاجی نەبوون. حەمدی ئەفەندی چایچی، وەستاساڵحی چایچی، دەروێش ئەحمەدی چایچی، وەستا ئەورەحمانی کەبابچی، وەستا ئەحمەدی حاجی سەیفوڵڵا، مەلا مستەفای حاجی‌مەلا ڕەسوول، شێخ محەمەدی مەحوی، برایم خان، مەلا حەسەنی عەلاف، وەکوو بێتەوە یادم مەلا ئەسعەدی مەحوی و ئەحمەدی کوڕی خۆی. ئەمانە و گەلێکی‌تریش، بەڵام لە بیرم نەماون؛ دیارە منیش بووم.

ئەم دەستەیە نوێژی شێوان لە خانەقای مەحوی نوێژ کرا و پاشان چووین بۆ ماڵەوە. کە چووین سەیر ئەکەین کورسی بە سێ‌لای حەوزەکەدا دانراوە، لای دیواری ڕێگا نەبوو، ئەو کورسییانە کە ئێستە پێی ئەڵێن: قەنەفە. کورسییەکان ئەوەندە زۆر بوون، ئەم هەموو خەڵکە کە زیاتریش بوون هەموو جێیان بووەوە یەك دوو گوڵۆپ لە بەرهەیوانەکە ئەسووتا.

لە پاش ئەوە کە دانیشتین، سەیرمان کرد شتێکی بن‌خڕی کەمەردار بە تەل لە بەردەمی هەیوانەکە دانراوە. سێ چوار پەڕی وەکوو گوێچکە تەنەکەی سپی کەوتۆتە ناو کەمە تەلەکەوە و لووتی تۆزێ ڕووەو سەر حەوزەکە شۆڕ کردۆتەوە. هەموومان لەو شتە بەلاجەوییە سەرسام ماین. حاجی مەلا عارف خۆی وتی: پانکەکە ئەمەیە. ئەمجا وردە وردە بەقاڵدرمەکانا سەرکەوت، چوو بە لایەوە شتێکی وەکوو تەنافی بە دەورا پێچرابوو، لێی نەوی سەرەکەی لە شوێنێکی‌تر قایم کرد، تومەز ئەمە سەری پلاکەکەی بوو، کردی بە شوێنی پلاکی دیوارەکەدا و لەولاوە دەستی نا بە دوگمەیەکا. کوتوپڕ ئەم شتە بەلاجەوییە کەوتە جووڵەجووڵ

و سوورِ خواردن بەملاوبەولادا. ئەم عالەمە هەموو واقی وڕ ما و سەری لێ تێك چوو، هەندێکیان ئەترسان.

ئەوەندەمان زانی نەرمە بایەکی لێوە پەیدا بوو و هات بە ڕووماناا. هەر ئەو نەرمەبایە ئەیدا لە سەر حەوزەکە، ئاوەکە وردە شەپۆلی لێ پەیدا بوو، گوڵۆپەکان بوون بە هەزار گوڵۆپ، ئیتر نان و مانمان لە بیر چووەوە هەر خەریکی سەیر کردنی ئەم غەزەبی خوایە بووین. ئێجگار لەوە سەرمان سڕ مابوو چۆن دەمێك بەولادا لا ئەکاتەوە و پاشان بەم لادا. لە ئەنجاما حاجی مەلا عارف بە زۆر هەڵیساندین وتی: نانەکەتان سارد بووەوە لە ڕاستیدا نانێکی چاکی دروست کردبوو. یارەبی بە ڕەحمەت بێ حاجی مەلا عارف لەگەڵ مردووی حازری.

١٣٦. ساڵی (١٩٣٨) بوو لەگەڵ شێخ نووری بابەعەلی و یەکێکی تریش بوو، چووین بۆ بەغدا. «شێخ مەحموودی مەلیك» لە بەغدا بوو لە گەڕەکی «سلێخ» دائەنیشت، چووین بۆ زیارەتی. دیواخانەکەی چەند کەسێکی تری لێبوو ئەوان هەستان، ئێمە ماینەوە. لە فەلەستینەوە هێشوویەکی دەنك درێژیان بە دیاری بۆ شێخ هێنابوو پێیان ئەوت «مۆز». شێخ سەر و دەنکی داینێ بیخۆین. بە دەستیەوە دامایین، نەمانزانی چۆنی بخۆین و چۆن ئەخورێ. شێخ هەستی پێ‌کرد، خۆیشی دەنکێکی هێنا لە بەرچاومانەوە پاکی کرد و خواردی وتی: ئاوا ئەخورێ. ئێمەش دەستمان کرد بە پێکەنین وتمان: یا شێخ بەخوا سولەیمانی تا ئێستە شتی وای نەدیوە.

خواوڕاسان لەو کاتەدا «فەرەج»ی ڕەشان بە بەرچنەیەکی گەورەی «ڕێواس»ـەوە کردی بە ژوورا، بەڵام ئێمە مۆزەکەمان خواردبوو، دەستمان

بە لێویشمانا هێنابوو. بەرچنە ڕێواسی لەولاوە دانا و هات دانیشت. شێخ چاك و چۆنی لەگەڵا کرد و فەرمووی: فەرەج ئەوە چیت هێناوە؟ وتی: قوربان نەختێ ڕێواسە. شێخ وتی: بیهێنن. لەو کاتەدا کە بەرچنەکەیان هێنا دوو سێ عەرەب و هەندێ ئەفەندی و هەندێ عەگاڵ بەسەر لە شێخەکانی عەرەب پاش سەلام، دانیشتن. شێخ لە ڕێواسەکەی بە دەستەوە بوو هەریەك سەر و ڕێواسی دا بە هەمووومان. کابرا عەرەبەکان تۆزێ سەیریان کرد و هەر بەو جۆرە بە توێکڵەوە بەربوونە خواردنی، ئەمجا ئێمە پاکمان کرد و خواردمان، عەرەبەکان زۆر تەریق بوونەوە! هەر ئەیانوت: «شنو هذا» بەڵام قسەی خۆمان بێ ئێمە ئاقڵتر بووین، دەنکە مۆزێکیشی دا بە فەرەج. فەرەجیش بە دەستیەوە داما بەڵام ئێمە تازە فێر بووبووین پێمان وت.

١٣٧. ساڵی (١٩٣٦) بوو لە چەقژ و قایکەندە لە نزیکی «باخان»ـەوە «سمایل عوزەیری» خستبوویان. حاجی قادری سمایل عوزەیری هەبوو گەورەی خێڵ بوو، پیاوێکی چوارشانەی کەڵەگەتی ڕوومەت و ناو سنگ پان. دنیا دەستی ساردی هەبوو، لە ژێر دەوارەکەدا دانیشتبووین، لە گوێ ئاگردانەکە بەرماڵێکی دابوو بە شانیا. تەمەنی، ئەو سەردەمە هەشتا ئەبوو، هەروا شتی بۆ ئەگێڕامەوە، یەکێ لەو شتانە باسی حەجەکەی خۆی بوو وتی: ئەو ساڵە لە وڵاتی سولەیمانی هەر من و حاجی برایماغای خەفاف چووین بۆ حەج. ئەو لەناو شاری سولەیمانی و من لە دەرەوە. وتم: چەند ساڵێك ئەبێ؟ وتی: بەخوا نازانم چل پەنجا ساڵێك ئەبێت. یەکێ هەشتسەد لیرەی زەردی عوسمانیمان هەڵگرتبوو. کە دەرچووین لە شار، بە دەف و زیکر و فیکرەوە ڕەوانە کراین. لەناو کەسوکارمانا بوو

بە شین و شەپۆڕ و گریان. بە کاروان و بە سواری وڵاخیش ڕۆیشتین، لە دەشتی عەرەبستانا بە سواری حوشتر ئەڕۆیشتین، لە هەندێ شوێنا بە کەژاوە ئەچووین. لە بەحری سپی سواری پاپۆڕ بووین، مەگەر خوا بیزانێ چەند شەو و چەند ڕۆژ لە پاپۆڕا بووین.

گەیشتینە «کەعبەی شەریف». لە کاتی تەوافا لە ئیحراما بووین، سەیرم ئەکرد گەلێ کەس سەیری سنگ و دەفەی شانی برایماغا ئەکەن. خوا لەشولارێکی پێ دابوو سپی سپی، ئەتوت بلوورە. هەموو شکڵێکی پیاوانەی تێدا دیار بوو، خەڵکەکەی‌تر هەموو ڕەش و بێ‌فەرش، ماشائەڵڵا خوا چی دروست کردبوو. پاشان چووین بۆ مەدینە و گەڕاینەوە بۆ وڵات. قەتارەی حوشتر وەکوو ڕیزی مێروولە وابوو. کە گەیشتینە سولەیمانی خەڵکێکی زۆر بە تەپڵ و دەف و بەیداخەوە هاتن بە پیرمانەوە. لەو ڕۆژەوە کە لە سولەیمانی دەرچووین تا هاتینەوە هەشت مانگمان پێ چوو.

**١٣٨.**ساڵێ (١٩٢٩) بوو پیاوێکم لەگەڵ بوو «خاڵە شامار»ی ناو بوو. پیری ڕیش‌سپی، تۆپی نوورانی، تەمەنی تەنگی بە حەفتا هەڵچنیبوو. کورتە باڵای بازۆڵە قەوی، ئەتوت پاڵەوانە. لە ڕاستیدا ئا لەو تەمەنەدا چوار گەنجی بەهێز چاریان نەئەکرد. لەوبەری سیروانەوە هاتین بۆ «نەوسوو»؛ من هیچم نەئەزانی ئەیوت: تۆ بڵێ: من «نصاب الصّبیان» ئەخوێنم. وتم: باشە. نازانم «نصاب صبیان»ـیش چییە، بەڵام کەوا و سەڵتەیەکم لەبەرایە وەکوو فەقێیەکی بچووك.

دیارە کاتی بەهارە، نەوسوو هەموو باخ و باخاتە. ماوەیەکی زۆر بەناو باخەکانا ڕۆیشتین، لەو ناوەدا خەڵك هاتوچۆیان ئەکرد، لە بەینی خۆیانا هەر ئەیانوت: «سان جە باخەنی». وەخت، پاش عەسر بوو هیلاك بووین،

لەسەر سەوزەلانییەك دانیشتین. خاڵە شامار سەبیلەکەی دەرهێنا، سەبیلێکی تێکرد. بەڵام شلەژەی ناو باخ هەریەکە کە «سان» لەناو باخایە.

ئەوەندەمان زانی سێ پیاوی کەڵەگەتی باڵا بەرزی ناوشان پان دەرکەوتن ڕووەو لای ئێمە هاتن. هەریەکە شەڕواڵ و مراخانییەکی ماوتی سەوزی تازەیان لەبەرایە، پشتێنی پەشمی عەجەمیان لە پشتایە، هەر یەکە خەنجەرێکی دەسك سپی وا بە بەر پشتێنەکەیانەوە، چەفتە و مشکییان بەستووە بە سەرەوە. سەر و کوڵەباڵێکی هەورامییان بە شانەوەیە، لە مەرەزی قاوەیی دروست کرابوو. هەر کە هاتن یەکێ لەو سیانە کوڵەباڵەکەی لە شانی خۆی کردەوە لە تەنیشت ئێمەوە خستیە سەر گیاکە و لە سەری دانیشت، بە چوار مەشقی. ئێمەش لووتێکی وامان پیا نەهێنا. دووەکەی‌تریش لە بەرانبەرییەوە بە پێوە ڕاوەستان. دانیشتووەکە لە منی پرسی: فەقێ بچکۆلەکە لە کوێوە هاتوون؟ وتمان: لەوبەری سیروانەوە. وتی: دەنگوباسی عەجەمەکان چییە؟ وتمان: ئەوا هەن. ئەو لە بارێکەوە پرسیاری ئەکرد، ئێمەش بە هەموو ساویلکەییەك جوابمان ئەدایەوە. ڕۆژ درەنگ بوو هەستا ڕۆیشت. لە کاتی ڕۆیشتنا وتی: کە هاتنە ناو دێ بچنە دیوەخانی سان.

ئەو ڕۆیشت و ئێمەش بە شوێن ئەوا هەستاین زۆر بە پەرۆش بووین بۆ بینینی سان. کابرایەك لەو نزیکە بێڵێکی بە دەستەوە بوو، گۆلی ناو باخەکەی چاك ئەکرد، چاوی لێبوو کە ئەو پیاوە لای ئێمە دانیشت. لێمان پرسی: هەر ئەڵێن: سان لەناو باخە، کوا خۆ دیار نییە؟ کابرا لە من مۆڕ بووەوە و هیچ سێ‌ودووی لێ نەکرد، تفێکی لێ کردم و وتی: «یانەت وێران بۆ ئانە سان بیەن جە لات نیشتەبێ»". تومەز ئەمە «جافرسان» بووە و ئێمە نەمانزانیوە. بەڵام بەلای ئەو کابرایەوە شتێکی زۆر زل بووە

کە جافرسان لای ڕووتەڵەیەکی وەکوو ئێمەوە دانیشتووە تا ئەو وەختە شتی وای نەدیبوو.

چووینە ئاوایی و ڕوومان کردە دیوەخان. دیوەخانەکە بەردەمەکەی حەوزێکی گەورە بوو هەموو سەر حەوزەکە دار و دارستان بوو. خۆر لە زەردەپەڕا بوو. کۆشك و سەراکە لە کۆشك و سەرای وەکوو ئەڵێن خوسرەو پەروێزی ئەکرد. ئەو ناوە جمەی ئەهات لە کوڕانی کوڵەباڵ لەبەری هەورامی، هەموو تفەنگ بەشان. لەشکرێکی زۆری لێبوو، ئێمەش ئاگامان لە هیچ نییە، ڕوومان کردە دیوەخان. نەیانهێشت بچین، تومەز جافرسان خۆی چاوی لێیە. بانگی کرد: لێیان گەڕێن. ئیتر ڕێگایان داین چووینە ژووری دیوەخانەکەوە. دوو لاکێشی زۆر گەورە و درێژ سەرەندازێك لە ناوەڕاستیانا. کە سەیرمان کرد ئەو پیاوە کە لەناو باخەکەدا لە تەنیشتمانەوە دانیشت، ئەوا لەوێدا لەو سەرسەرەوە بە چوارمەشقی دانیشتووە، وتی: دانیشن. لەلای خوارەوە شوێن هەبوو، دانیشتین.

چۆنیەتی شوێنەکە سەرنجی ڕاکێشام، ئێجگار کە سەیرم کرد دوو منداڵی جوانکەلە جافرسان لە بەردەمی خۆیا داینـاون، بەملاوبەولای ژوورەکەدا هەر سەرەیەك چواردە کەسی لێ دانیشتبوو، هەموو پۆشتە و پەرداخ و غەرقی فیشەك. هەریەکە تفەنگێکیان لەسەر کۆشیان دانابوو. ئەمانە کە دانیشتبوون بیستودوویان کوڕەکانی خۆی بوون، شەشیان برازا و خزمی زۆر نزیکی بوون. لەو کوڕانە وەکوو: کەریمبەگی خانەگا، حەمەڕەشی بەگی پاوە، قادربەگی تەوێڵە لە خزمەکانیشی وەکوو: ئەفراسیاوبەگی هانەگەرمەڵە. قسە و باسیان باسوخواسی عەسکەری ئێرانی بوو؛ تومەز ئەمە وەکوو موئتەمەر چەبیرەیەکی گرتووە و هەموو کوڕ و خزمە نزیکەکانی بانگ کردووە و قسە لەو شەڕە ئەکەن، تا پێنجسەد

تفەنگ بەدەستێکیش لەو ناوەدا هەبوو. شەوێ کە نان هات هەر بە دوو کەس سینییەك؛ هەموو برنج و مریشك و گۆشتی حەیوان بوو.

١٣٩. هەتا سالانی (١٩٢٥) لە شارەکانی کوردەواری نرخی گرانی و هەرزانی خانووبەوە دائەنرا، کە ئەگەر نزیك بوایە لە مزگەوت و حەمام و بازاڕ، ئەو خانووە زۆر بەنرخ ئەبوو. لە سالانی (١٩٣٠)دا ئەگەر یەکێك لە شاری سولەیمانی خانوویەکی بکڕیایە بە هەزار ڕووپیە، ئەو کەسە تەپڵی شایی لێداوە؛ هەردوو ڕووپیەش سەدوپەنجا فلس بوو.

١٤٠. ساڵی (١٩٣٠) بوو کوڕێکم لەگەڵا بوو، «فەقێ برایم»ـی ناو بوو. دنیا هاوین بوو، ڕێمان کەوتە «شەدەڵە». ئەو سەردەمە شەدەڵە ناو و ناوبانگێکی هەبوو. شێخ «عبدالکریم» لە شەدەڵە و حاجی شێخ عارف لە «سەرگەڵوو» دائەنیشتن. «حەقە»کان ناویان دەرکردبوو، پەرەیان سەندبوو بۆ ئەوبەری «زێ» و وڵاتی کەرکووك و سولەیمانی، وە بەڵکوو ناوچەی پشدەر و مەرگەی داگیر کردبوو.

شەدەڵە خۆی ڕووبار و شیوێکی گەورەی هەبوو کەوتبووە جنووبی ڕووبارەکە. شیوەکە خانەقاکەی کەرت کردبوو لە گوندەکە. ئێمە چووینە تەکیەکەوە. تەکیە ژووری مزگەوتێکی گەورە بوو، بەرهەیوانێك بە بەریا کشابوو لە تەنیشت مزگەوت و بەرهەیوانەکەوە بەلای ڕۆژهەڵاتەوە سەربانێك بوو؛ ئەمانە هەموو بە خشتی کاڵ درووست کرا بوون؛ بەلام لەسەر شێوەی شارستان بەردەم و دەوروبەریشی هەموو دارستان و چڕ بوو. سۆفییەکان هەموویان ڕیشیان درێژ بوو.

چێشتەنگاو بوو ئێمە ڕۆیشتین، چووینە خانەقا شێخ لە ماڵەوە بوو. «حاجی مەلا یووسف»ـێکی سوورداشی هەبوو ـ کە لە سەردەمی

عوسمانیدا قازی بوو. زەمان پشتی تێکردبوو کەوتبووە شەدەڵە. پیاوێکی پیری ریش سپی نوورانی بوو، ماڵەکەی لە گوندەکەدا بوو، بەڵام خۆی زۆرتر وەختی لە خانەقادا ڕائەبوارد. ئەو پێی خۆش بوو کە ئێمە چووین. لەگەڵمان کەوتە قسە کردن و داخی دڵ هەڵڕشتن و نیوەڕۆ نانیان بۆ هێناین. سۆفییەکان لەو ناوەدا هەر هاتوچۆیان بوو، بە چاوێکی وەنەبێ دۆستایەتییەوە، سەیری ئێمەیان بکردابایە؛ هەر بەینێ نە بەینێ یەکێکیان مرقەیەکی لێوە ئەهات و یەکێکی‌تر وەیا چەند کەسێکی‌تر پێکەوە ئەیانوت «حەقە». سۆفییەکان گەنجیشیان تیا هەبوو، پیریشیان تیا هەبوو. بە دەوری خانەقادا سۆفی ئافرەتیشمان بەرچاو ئەکەوت.

کەوتە پاش نیوەڕۆ و دەمەدەمی عەسر شڵەژەیەك پەیدا بوو. سەیرمان کرد نزیکەی حەفتا سۆفییەکی مەرگەیی پەیدا بوون کە هاتبوون بۆ ماڵی شێخ. هەموو ریشدار ڕیشدار، هەر کە گەیشتنە جێ، بوو بە مرقوهۆڕ و جەزبە و هەرایەك ئەوسەری دیار نەبێتەوە. ئەوا ئێمەش لە بەرهەیوانەکە لەگەڵ حاجی مەلا یووسف دانیشتووین. ئەمانە کە هاتن، بەرهەیوان و ژووری مزگەوتەکە پڕ بوو. سۆفی‌تریش لە ئاواییەوە هاتن. مەرگەیییەکان ڕانکوچۆخە و پەستەکیان لە بەرا بوو، بەدەم جەزبەوە جنێو وەکوو بارانی بەهار ئەباری؛ کە یەکێکیان جنێوێکی ئەدا ئەوان هەموو ئەیانوت: «حەقە».

ئێمە زۆر ئارەزووی چاوپێکەوتنی شێخمان بوو، بەڵام شێخ هێشتا نەهاتبووە دەرەوە. قسە کردنی ئەو بەینەمان لەگەڵ حاجی مەلا یووسفدا ئەوەبوو: کە چۆن توانیویەتی لەناو ئەمانەدا دانیشتووە و دائەنیشێ؟ حاجی مەلا بۆنکرووزەی لە جەرگ هەڵئەستا، زۆر زۆر دوژمنی ئەو کردەوانەی ئەوان بوو، بەڵام ئەیوت: زەمان و پێوەندی ماڵ و منداڵ منی لەم شەدەڵەیەدا بەند کردووە.

نوێژی عەسر هەرکەس کردی کردی، هەرکەسیش نەیکرد ئەوا هیچ. سۆفییە مەرگەییەکان هەموو بە ڕیزە لە بەرهەیوانەکەدا دانیشتبوون، سۆفیتریش و هی ئاواییش لە بەردەمی بەرهەیوانەکەدا ڕاوەستابوون. ژنە سۆفییانی مەرگەیی لەگەڵ ژنانیترا ئەوانیش لەولاوە ڕاوەستابوون. ئەمانە تێکڕا جەزبە گرتبوونی، هەموو مرقوهۆڕیان بوو. حاجی مەلا ئەویش لەو سەرەوە دانیشتبوو، من و فەقێ برایمیش تۆزێ لەلای ئەوەوە بەلای پشت بە قیبلەی هەیوانەکەوە بە تەنیشت یەکەوە کزۆڵەمان کردبوو. بەڕاستی لەو دیمەنە ئەترساین و چاریشمان نەبوو.

لەناو سۆفییە مەرگەییەکانا سۆفییەکی گردە پیاوی ڕیش درێژ هەبوو پێیان ئەوت: «دێوانە حەبیب». ئەمە جەزبە گرتبووی و بە بەرهەیوانەکەدا و بەناو خەڵکەکەدا ئەهات و ئەچوو و جنێوی ئەدا. هەر کە جنێوێکی ئەدا ئەوانیتر هەموو ئەیانوت: حەقە. حاجی مەلا یووسف قوتوو جگەرەکەی لە بەردەمی خۆیا دانابوو، دێوانە حەبیب چوو دوو جگەرەی لێ هەڵگرت و هێنای بۆ ئێمە و وتی: «ئەم». لەو کاتەدا کە جگەرەکانی هەڵگرت حاجی مەلا یووسف سەیرێکی کرد و وتی: «تەماشاکە ئەم مەلعوونە». پەنا بەخوا هەر کە ئەو ئەمەی وت چ قیامەتێك هەستا. شڵەژە کەوتە ناو سۆفییەکانەوە. یەکێك وتی: کافر! ئەوە وەلییە تۆ چۆن پێی ئەڵێی مەلعوون؟ یەکێ وتی: دایەلێت دەگێم هەر ئێستە ورگت دەدڕم و پەلاماری خەنجەرەکەی دا. یەکێکیتر دەستی برد خەنجەرەکەی لە دەست سەند.

دێوانە حەبیبیش هەر هاتوچۆیەتی و ئەمرقێنێ و ئەڵێ: حەقە. لەم لاشەوە ئێمە کە جگەرەکانی بۆ هێناین، گوایە بەو نیازە کە ئەمە بە زۆر هێناویە و زۆریش حەرامە و ناشتوانین وەری‌نەگرین، هەروا لە بەردەمی خۆمانا دامانانابوو. دێوانەحەبیب لە هاتوچۆوەکەیا چاوی پێ کەوت،

چوو شقارتەی قوتووەکەی حاجی مەلا یووسفی هێنا و هاتە بەردەممان شقارتەی داگیران و وتی: ئم، دایەلێتان دەگێم پێ‌کەن، حەقە. ئەمجا ئێمە ئیتر ئەوێرین داینەگیرێنین؟ ئەوا جنێوێکیشمان لە سەر خوارد.

سۆفییەکان هەر خەریکی قسە وتن بوون بە حاجی مەلا یووسف. حاجی مەلا یووسفی هەژاریش چووەتە قوڵاخی خۆیەوە. یەکێ لە سۆفییەکان رووی کردە حاجی مەلا یووسف وتی: ئەهاو ئەهاو سەر سپییەی ڕیش پۆزە، تۆ بە دێوانە حەبیب دەڵێی مەلعوون؟ دێوانە حەبیب خوایە تۆ چۆن وا دەڵێی؟ دەستی کرد بەم قسانە و هەر نەیبڕییەوە. هەرچەند ئەو قسەیەکی ئەکرد هەموو سۆفییەکانی‌تر بە جارێ ئەیانوت: حەقە.

ئەوەندەمان زانی دێوانە حەبیب چوو بەلای کابرای سۆفییەوە دەستی گرت و هەڵیساند، چووە پشتیەوە شەقێکی زۆر نایابی تێ‌هەڵدا، بەڵام شەق. کابرا وتی: حەقە، بە شەق تێ‌هەڵدان بردی تا بەردەمی حاجی مەلا یووسف؛ کە شەقەکەی تێ‌هەڵئەدا ئەو ئەیوت: حەقە و ئەم ئەیوت: «دایەلێت دەگێم لۆ لەسەر من دەکەیتەوە؟». هەرچی ئەم ئەیوت ئەو هەر ئەیوت حەقە. ئەمجا لەولاوە بە کوت پێوەدان هێنایەوە بۆ ئەم سەر و هەرچەند کوتی پێوە ئەدا ئەیوت: «دایەلێت دەگێم تۆ کوو لەسەر من وە جواب دێیت؟» ئەویش ئەیوت: حەقە و هەموو سۆفییەکانی‌تریش هەر ئەیانوت: حەقە.

پاش ئەوە کە دێوانەحەبیب هەندی سەگ‌بەحەساری بەو کابرا سۆفییە کرد، کتوپڕ لەو کاتەدا کابرایەك کەرێکی دابووە پێش بە لای بەرهەیوانەکەدا ئەڕۆیشت. دێوانەحەبیب کە چاوی بە کەرەکە کەوت لە کۆڵ کابرا بووەوە و چوو بۆلای کەرەکە و وتی: «ئەوا شێخی هات!». کە ئەمەی وت هەموو سۆفییەکان وتیان: حەقە. ئەمجا چوو بەلای

کەرەوە و دەستی کرد بە شەق تێهەڵدان و وتی: «دایەلێت دەگێم نووکە دێیت؟ ئەرێ وەڵڵا حەقە». هەموو سۆفییەکان وتیان: حەقە.

١٤١. شێخ عەبدولکەریم، چایچییەکی هەبوو، وا دێتەوە بیرم کە مەلا عەبدوڵڵای ناو بوو. سەعات نزیکی یانزەی ئێوارە بوو هات وتی بە ئێمە: کە ئێستە شێخ تەشریف دێنێت دێم بە شوێنتانا. زۆری پێنەچوو هات وتی: فەرموون بۆلای شێخ. هەستاین لە دەرگای هەیوانەکەوە چووینە سەر بانەکە، هەموو بەڕەی تیا ڕاخرابوو، سەماوەرێکی زەردی هەشت تەرخان، قۆرییەکی عەجەمی بەسەرەوە بوو. ئیستکانەکان لەناو سینییەکا لە بەردەمیا دانرابوون، دوو سێ دۆشەکەیش لەو سەرە ڕاخرابوون، کەسی لێ نەبوو هەر مەلا عەبدوڵڵا بەلای سەماوەرەکەوە ڕاوەستابوو.ماڵی شێخ نووسابوو بە سەر بانەوە. شێخ کە لە ماڵ ئەهاتە دەرەوە بۆ خانەقا لەوێوە سەر ئەکەوت، ئێمە لەسەر بەڕەیەك لەملای دۆشەکەکانەوە دانیشتین. ها زۆری پێ نەچوو شێخ دەرکەوت، بە پێپلیکانی ماڵەکەی خۆیانا سەرکەوت بۆ سەر بانەکە. شوێنی سەربانەکە وابوو سێ لای بە دیواری ژووری خانەقا و بەرهەیوان گیرابوو، لایەکی چۆڵ بوو، ئەویش حەوشەی ماڵی شێخ بوو، کە ئەهات کەسی‌تر بێجگە لە هی سەربان چاوی لێ نەئەبوو.

کە شێخ هات، ئێمە ڕاست بووینەوە. شێخ عەبدولکەریم پیاوێکی کەڵەگەتی باڵابەرزی ناوشان و سینگ پان، تەمەنی ئەو سەردەمە چل تا چل‌وپێنج ساڵ ئەبوو. چاو و برۆی گەورە، ڕیشێکی ڕەشی قەترانی، تەنگی بە ناوکی هەڵچنی بوو. جوبەیەکی قاوەیی ئاوەڵدامانی کردبوو بەسەر کەوا و سەڵتەکەیا، مێزەرێکی گەورەی سپی شێخانەی بەستبوو

بە سەرەوە. بەڕاستی عینسانی وا جوان و بەدیمەن و شایانم کەم جاریتر چاوپێکەوتۆتەوە.

هەر کە هات سەلامێکی کرد و چووە سەر دۆشەکەکەی سەرەوە دانیشت وتی: بەخێر بێن فەقێینە. ئێمە ئیتر لە شوێنەکەی خۆمان دانیشتینەوە وتی: لەوێ دامەنیشن فەرموونە سەر دۆشەکەکە لە تەنیشت منەوە دانیشن. ئێمەش چووینە ئەو شوێنە و مەلا عەبدوڵلا چای تێکرد هێنای بۆ هەرسێکمان. پاشان بە مەلا عەبدوڵلای وت حاجی مەلا یووسفیش بانگ بکا. ئەویش هات دانیشت. سۆفی پێیان زانی کە شێخ لە ماڵ دەرکەوتووە و هاتووە لەوێ دانیشتووە، بوو بە مرقوهۆڕ و هەرا، پەلاماری سەر بانیان ئەدا، بەڵام ڕێگا نەبوو بێن. جنێویان بەدەم جەزبەوە ئەدا وەکوو گەڵای دار. یەکێ ئەیوت: دایەلێت دەگێم چما خۆت شاردیتەوە؟ یەکێ ئەیوت: ئۆهۆ ڕیش کلکەکسۆك لە دینت بەم. یەکێ ئەیوت: چما دەرناچیت؟ هەر ئەبێ لە ...ژنت بەرم. لەم جۆرە شتانە هەر زۆر زۆر. لەم وەختەدا ئەوەم هاتەوە بیر کە لە شوێنێکا سەگەڵ دەوری ماڵێك ئەدەن و ڕێگا نییە بچنە ژوورەوە بۆ کابرای غەریب بیخۆن هەر پەلاماری دار و دیوارەکە ئەدەن، ئەوەشم بەلاوە وابوو.

شێخ ئەم هەموو شتانەی گوێ لێ ئەبوو، سەری داخستبوو، بەدەم سەرداخستنەوە وردەوردە قسەی بۆ ئێمە ئەکرد. ئەمانەی بەلاوە شتێکی وا نەبوو، وای پیشان ئەدا کە ئەمانە جەزبەی سۆفێتی گرتوونی و ئاگایان لە خۆیان نییە.

من ئەو وەختە تۆزێ زیتەڵە و قسەقوت بووم، خۆمم پێ ڕانەگیرا وتم: یا شێخ ئەمە چییە و چ حاڵێکە؟ وتی: ڕۆڵە ئەمە لە حاڵی جەزبەدان. ئەو قسانە کە ئەیکەن ئاگایان لە خۆیان نییە. وتم: یا شێخ ئەمە مەسەلەی

یەك کەس و دوو کەس نییە، ئەمانە هەموو ئەو ڕێگایە کە گرتوویانە، وەنەبێ ڕێگایەکی باش بێ. دوور نییە لە ئەنجاما خراپتر ببن. تۆ ئیشێکی وا بکە جڵەویان بگرەوە؛ هەندێ قسەی کرد من هەر بۆم نەسەلماند.

کاتی بانگی شێوان هات بانگیان دا، شێخ هەستا ڕووی کردە ژووری مزگەوتەکە و ئێمەش هەستاین. هەر کە دەرکەوت بۆ ژووری مزگەوت، پەنا بەخوا بوو بە چ قیامەتێك؟ لە دەنگە دەنگی سۆفی و سۆفیژن ئەو ناوە بوو بە ڕۆژی قیامەت.

ئەوەم لە بیر نەبوو بیڵێم: پێشووتر هەرکەس هەر جنێوێکی ئەدا بە جارێ ئەوانیتر ئەیانوت: حەقە. یەکێ تەقەی لە شتێکەوە بهێنایە بە جارێ سەد کەس ئەیوت: حەقە. سەر لە ئێوارە بوو کەر ئەیزەڕان ئەیانوت: حەقە. بە کورتی هەرکەس هەر شتێکی بکردایە و هەر شتێکی بوتایە ئەوانیتر ئەیانوت: حەقە. یەکێك سەبیلی ئەکێشا یەکێکیتر ئەیدا بە ژێر دەستیا ئەیوت: حەقە.

خێرا شێخ وتی: قامەت بکەن. یەکێك قامەتی کرد و شێخ خۆی پێشنوێژی کرد. هەر کە ئەو وتی: «الله اکبر» هەموویان وتیان: حەقە. مزگەوتەکە گەورە بوو، پڕ بوو، ئەمجا کە ئەوانیش نیەتیان هێنا لە نوێژەکەدا نیزامی نوێژ نەما. یەکێ لەو پەڕەوە مرقەیەکی ئەکرد، یەکێ لەم پەڕەوە ئەیوت: حەقە. هی وا هەبوو لە ڕیزێکی دواترەوە بوو شەقێکی لەوەی بەردەمی خۆی هەڵئەدا ئەیوت: حەقە. سۆفییەك لە پشت شێخەوە بوو، شەقێکی لە شێخ هەڵدا لە نوێژەکەدا هەموو ڕیزی پێشەوە کە چاویان لێبوو وتیان: حەقە. ئەوانیتر کە گوێیان لەمان بوو ئەوانیش بە جارێ وتیان: حەقە.

بەم جۆرە نوێژی شێوان کرا و شێخ گورج گەڕایەوە بۆ سەر بانەکە.

ئێمەش زوو گەڕاینەوە، بەڵام من زۆر ئەترسام و زۆریش لەم کارەساتە دڵگران بووبووم. ها خەیاڵ نەکەی شەقیان تێ‌هەڵنەدابووم، بەڵام لە شەق تێ‌هەڵدان ئەترسام. کە هاتینەوە وتم: یا شێخ بەخوا ئەمە حاڵ نییە. شێخ ئەم جارە ئەوەی درکان وتی: «کاکە فەقێ، لە دەست دەرچوون و چار ناکرێن».

نانیان هێنا نانمان خوارد، نوێژی خەوتنانیشمان وەکوو نوێژی شێوان کرد. پاشان چووەوە بۆ ماڵەوە بە مەلا عەبدوڵڵای چایچی وت: مەلا عەبدوڵڵا ئاگات لەم فەقێیانە بێت. کە شێخ چووەوە مەلا عەبدوڵڵا هات دانیشت و چاشی بۆ هێنناینەوە. لە دەرەوە دەنگە دەنگی ژن و پیاو هەر زۆر زۆر بەر بووەوە وتم: ئەوە چییە؟ مەلا عەبدوڵڵا وتی: ئەوە سۆفییەکان «شوغڵ» ئەکەن. شوغڵەکە ئەوە بوو ژن و پیاو تێکەڵ ئەبوون و های و هوویان ئەکرد، گوایە ئەمە زیکر ئەکەن! بەڵام ئەوان پێیان ئەوت: «شوغڵ».

ئەمجا هەندێ سەرم خستە سەر مەلا عەبدوڵڵا، ئەمە چۆن وا ئەبێ؟ خۆ تۆ مەلایت، کەی ئەمە بە چاو دینەوە دروستە؟ وتی: تۆ وا مەزانە، ئەوە هەر بە دوو کەس کێوێك لە بەینیانایە، لەشی هیچیان ناکەوێ لەوی‌کەیان و هیچیان گوێیان لە دەنگی ئەوی‌کەیان نییە. حاجی‌مەلا یووسفی هەژاریش وەختەبوو شەق بەرێ. ئەو زوو هەستا بە هەرجۆر بوو چووەوە بۆ ماڵی خۆیان. ماینەوە ئێمە و مەلا عەبدوڵڵا. مەلا عەبدوڵڵا هەر لەو سەربانە جێگای بۆ چاك کردین بۆ نوستن، هەموو دەرکەی ئەم‌لاوئەولای داخست. سۆفی پەلاماریان ئەدایەن، جارجار بە جنێو دانەوە، بەڵام ڕێگا نەبوو بێن.

ئەڵێم نوستن، بەڵام نوستنی چی! ئەو شەوە تا بەیانی خەو بێت

و نەچووەتە چاوی ئێمە، هەم لە ترسی پەلاماردانی ئەوان، هەم لە دەنگی مرقوهۆڕیان. وەکوو بۆم دەرکەوت ئەگەر بەرپەلیان بکەوتینایە پارچە پارچەیان ئەکردین. چونکە ئێمە فەقێ بووین و ئەوان جەزبە گرتبوونی. ئەو شەوە دەنگی حەقە ئەچوو بە ئاسمانا. درزێك هەبوو بە دیوارەکە لەوێوە سەیرمان ئەکرد بەناوی زیکر و جەزبەوە هەڵئەپەڕین و پەلاماری یەکیان ئەدا و ئەیانوت: حەقە. سۆزیشیان بە دەمەوە ئەکرد. چاوم پێ‌کەوت پیاوی پیر و ژنی پیر ڕووبەڕووی یەك دەستی یەکیان گرتبوو هەڵئەبەزینەوە، بەو جۆرە زیکریان ئەکرد و ئەیانوت: حەقە. بەڵام شتی‌ترم لێیانەوە نەدی. لەناو ئەوانا وا بڵاو بوو ئەگەر ژن و پیاو لە باخەڵی یەکا بخەون کێو لە بەینیانایە. بەیانی پێش چا خواردن بەبێ ئەوە شێخمان چاو پێ‌بکەوێ شەدەڵەمان بەجێ‌هێشت.

١٤٢. ئاخر و ئۆخری ساڵی (١٩٢٩) بوو ڕێمان کەوتە «گڵۆڵان»؛ گڵۆڵان گوندێکە لە موکریان. شوێنی ئاواییەکە دەشت بوو، لای سەرووی کێو بوو، دنیا سەوزەڵانی بوو، مزگەوت و حەوز و سەرا و مەدرەسەیەکی باشی لێ‌بوو. «مەلا وەهابی نجنەیی» مامۆستا و مەلای ئەوێ بوو؛ سەر بە شێخانی تەوێڵە بوو. کوێخا سمایل هەرچەندە کوێخای گوندەکە بوو، بەڵام پیاوێکی بە دەسەڵات بوو، شانی ئەدا لە شانی ئاغا و بەگزادەکانی ئەو ناوە. دوو کوڕی مناڵی جوانکەلەی هەبوو، لە دەورووبەری چوارده ساڵانا. ئێمە کە حەفتەیەك لەوێ مابنەوە، لەگەڵ کوڕەکانا بووین بە ڕەفیقێکی تەواو؛ داخی گرانم ناوەکانم لەبیر چووەتەوە. گوندی گڵۆڵانیش زیاتر بوو ئەو وەختە لە سەدوپەنجا ماڵێك.

شایی بوو لە گڵۆڵان، بەڵام چۆن شاییەك؟ شاییەك بێ هی بەگزادەی

دێبوکری بێ، حەوت بووك لەو شاییەدا بگوێزرێتەوە ئەبێ چۆن بێ؟ حەوت بووکی ماڵە بەگزادە، هەرچی ئاغەوات و بەگزادەی دێبوکری، فەیزوڵڵابەگی، مەنگوڕ، مامش هەبوو ڕژابوونە ئەو شاییە. ژنە بەگزادە و ژنە ئاغەواتی ئەمانە هەموو لە گلۆڵان کۆبوونەوە. ژنانی مانگ ڕوو، گشت پڕ حەیا و بە ئابڕوو. لە بناغەدا ئاو و هەوای موکریان بەردیش جوان ئەکا نەوەك ئینسان! ئەمجا جوانیی لە لەشولار و ڕوومەتی ئافرەتا خۆی دەرخا، ئافرەتیش هی موکریانی بێ، هی بەگزادە بێ، هی شادی و زەماوەن بێ، ئەبێ چۆن بێ؟...!

ئەم ئافرەتانە بە خەرمان لە گلۆڵانا بە جلی تافتە و قەیفەی زەڕبەفتەوە کەوتبوون. پیاوانی بەگزادەی هەموو ئەو وڵاتە هەموو بە مراخانی و شەرواڵی ماوتی عەجەم، پشتێنی شاڵی عەجەم، خەنجەری مستوو و ماهی بە کەمەرەوە، شەدە و مشکی بە سەرەوە، تفەنگی جانبێزار و سێ تیر بەشانەوە، لەسەر ماینی عەرق لە ڕەختی زیو و زێڕەوە، ئاخۆ ئەبێ چۆن بووبێ؟ وەیا ئەم ئافرەتە نازدارە بەگزادانە بە کراسی کرێشەی ئاوەڵدامانەوە، بە پشتێنی پەشمی سەقزیانەوە، بە سەروپێچی سرکەیی وشکەوە، بە سوخمەی کەمەرزێڕی تافتەوە، بە غەرەقی سەر و مل و سوخمە و کەمەر لە ئاڵتوونەوە بۆ سەر شایی حەو بووکی گلۆڵان هاتبن و دەست بکەن بە چاوی مانگدا، ئاخۆ ئەبێ چۆن بووبن؟...!

ئەم حەوت بووکە دووی لە بەگزادەی دێبوکرییەوە لە گلۆڵان ئەچوو بۆ فەیزوڵڵابەگی، سێ لە فەیزوڵڵابەگییەوە ئەهات بۆ گلۆڵان، یەکێ لە مەنگورەوە یەکێ بۆ مامش ئەچوو.

چل ڕۆژ شایی بوو، چل ڕۆژ دەهۆڵ و زوڕناژەن لە سابڵاخ و سەقز و مەراغە هاتبوون، چل ڕۆژ ڕمبازی سوار و تەقەی تفەنگچی بوو.

چل ڕۆژ هەڵپەڕکێ و ڕەشبەڵەك بوو. ڕیزی هەڵپەڕکێی کوڕانی مشکی بەسەر و کچانی کرێشە لەبەر کە ڕیزی لە کۆڕی ڕەشبەڵەکا ئەوەستا، ئەتوت ئەستێرە زێڕینەی ڕۆخی ئاسمانە. زرینگەی تەوقەسەر و لاگیرە و شریخەی سەر دەسماڵی سەرچۆپی کێش کە تێکلاوی جیرەی پەنجە بە خەنەی پەنجە وشراوان ئەبوو، ئەیدا لە دڵی فریشتە و ئەکەوتە خۆزگا بۆ ئەوە ئەویش نەفسی ببوایە و بهاتایەتە ڕیزا!. بەلام نەئەهات، هەر سەیری ئەکرد. سەیری چاومەستان، سەیری کلاولاران، سەیری بەگزادە و خانمی دیاران، سەیری شاییەکەی چل ڕۆژی گلۆلان.

نەوەك تەنها ئاغەوات و ئاغاژنانی دێبوکری کۆ بووبوونەوە، بەڵکوو زۆر لە دانیشتووی گوندەکانی موکریانی ڕژابوونە ئەو شاییەوە. هیچ شەو و ڕۆژێك لە سێ هەزار کەس کەمتر لە گلۆلان نەبوو. هەموو بە جلی ئاڵوواڵاوە؛ لە لایەك هەڵپەڕکێ بوو، لە لایەك ڕمبازی سوارانی پۆشتە و پەرداخ بوو، لە لایەك کۆڕی گۆرانی و بەستەی موکریانی بوو، لە لایەك دەستەی چێشتکەران سەرگەرمی نان دروستکردنی ئەو حەشامەتە بوون. هەموو ڕۆژێ چل تا پەنجا سەر مەڕ ئەکوژرایەوە. کێبەکێ بوو، هەر ڕۆژێ تا دوو هەزار تاکە تارانی و جووتەی عەجەمی ئەو سەردەمە ئەکرایە شاباشی نازداران و لاوچاکان. پیری مەیخانەش هاتبووە کۆڕی چواردە ساڵانەوە تا پەنجا سەماوەری هەشت تەرخانیش لەولاوە ڕیز کرابوو.

نەرمە قریوەی دەنگی هەڵپەڕکێ، شەڕی لوولێنە لەگەڵ گۆی مەمکێ، جیڕی شبرەوی کوڕگەلی موکری، دەنگی بەنازی کچی دێبوکری، قریوەی سەرچۆپی ئەچەمایەوە، خێرا تەنیشتی گل ئەدایەوە. ئەمانە هەموو لە دێی گلۆلان چل شەو و چل ڕۆژ ئەمەبوو حاڵیان.

مەلا وەهابی نجنەیی کە مامۆستای گلۆلان بوو لەبەر ئەم زەماوەن

و ڕەشبەڵەکە گلۆڵانی بەجێ‌هێشت و تا ماوەی ئەو چل ڕۆژە چوو لە دێی «حەمامیان» دانیشت. فەقێکانی ئەمەیان بە هەل زانی و ئەوان نەچوون. مەلا شەریفی نەوباری هەبوو کە یەکە فەقێی مەلا وەهاب بوو، زۆرتر سەرچۆپی ئەو هەڵپەڕکێ و ڕەشبەڵەکە بەدەست ئەوەوە بوو. بەڕاستی هەڵپەڕکێش هەر بۆ ئەو هاتبوو.

ئێمە تا حەفتەیەك ماینەوە و لە پاشا گلۆڵانمان بەجێ‌هێشت. پاش چەند ماوەیەکی زۆر بیستم ئەو شایی چل ڕۆژەی گلۆڵان لە پاش شەش مانگێك بوو بە ماتەم، ئەو ئاغەواتانەی لەوێدا کۆبوونەوە هەموو تووشی دەربەدەری و ماڵوێرانی بوون.

١٤٣. کارەساتی ڕۆژەکان زۆر سەیرە، پەردە ئەداتە لاوە وەکوو پەردەی ئەلبووم، کە لە هەر لاپەڕەیەکیا چەند وێنەیەك هەیە، وەیا وەکوو دێوجامە، گەلێ ڕەنگی تێدا هەیە.

جەنگی (١٩١٤ ـ ١٩١٨) دوایی هات، تەنها ١٧ میلیۆن کەسی تیا کوژرا و ٢٦ ملیۆنیش بریندار و پەککەوتوو بوون. لە ئەنجامی ئەم شەڕەدا کە دوایی هات گرانی و تاعوون و ڕشانەوە و بەدبەختی و دەربەدەری بوون بە بەشی کوردەواری. بەڵێ، دەستدار بێ دەستی ئەخوارد، هەرکە بۆ خۆی باوی سەند. هەندێ لە عەشایر بوون بە ئاگر و کەوتنە گیانی خەڵکی‌تر.

«علی‌محمد خان شریف الدّوله» لەلایەن حوکوومەتی ئێرانەوە لە ناوەندی (١٩١٨) کرا بە حاکمی وڵاتی «سنە». لە ڕاستیدا وڵاتی سنە ـکە وڵاتی ئەردەڵان بوو ـ وڵاتێکی بە تەواوی ئاڵۆزاو بوو. هەموو ئەم ئاڵۆزاوییەش ئەوە بوو کە جەنگی یەکەم هەرچەندە بەناو بەسەر چووبوو، بەڵام بەدبەختی پاشەلەقەی شەڕ تازە دەستی پێ ئەکرد. لەو ماوەیەدا

و لە پێش ئەو ماوەیەشدا هەموو ئەو وڵاتە وەکوو وڵاتانیتر بووبوو بە پاشاگەردانێ، کەس خەتی کەسی نەئەخوێندەوە. دەورەی عەشایری بەهێز زۆر لە باوا بوو. لەناو شارەکەدا دوو بەرە بەناوی «سووسیال» و «دیموکراس»ـەوە پەیدا بووبوو، لە دەرەوە عەشرەتەکانی «گەڵباغی» و «مەنمی» خەریکی سەربزێوی و چەپاو کردن بوون. فرکان فرکان بوو، کێ ئازا بوو نانێکی بۆ خۆی بفڕاندایە. پێش ئەوەش ڕووسی قەیسەری شکا و لەشکری شکاوەی داخ لە دڵ کە بگەڕێتەوە، ئەبێ چی بکا و چی کردبێ؟

ئەم دوو عەشرەتی گەڵباغی و مەنمییە بەڕاستی زیانیان ئەگەیاند بە مەردم، بەڵام هەموو زیان گەیاندن ڕەوای هەق نەبوو هەر بدرێتە لای ئەوان. کە «شریف الدّوله» هات هەندێ کەس لەو ڕۆژەدا خۆیان دایە پاڵی و دەستیان کرد بەخۆ بردنە پێشەوە لەلای ئەو. لەناو بردنی گەڵباغی و مەنمی بوو بە دەستەگوڵێك و درا بە دەست ئەو شەریفوددەولەیەوە کە بە تاقە زەلامێ هاتە ناو شاری سنەوە، لە ڕۆژێکا کە حوکوومەتی قاجاریش زۆر بە عەزیەت هەناسەی ئەدا. کەوابوو ئەمە وەکوو پەندە کوردییەکە ئەڵێ: «کردەی کەر و خوردەی یابوو بوو؛ وە یا بە قسەیەکیتر ئەڵێ: «کێ کردی و کێ خواردی؟»»!

من لەم درێژە پێدانەدا مەبەستم یەك شتە: مەبەستم دەرخستنی ئەستێرەژمێری یەکێك لەو گەڵباغییانەیە کە «ئاغەبراخان»ـە.

ئەم ئاغە براخانە پێیان ئەوت: «قیبلەی عالەم». وە یەکێك بوو لە سەرۆکە گەورەکانی گەڵباغی. پیاوێکی ڕیش سپی قەڵەوی تا ئەندازەیەك کەڵەگەت بوو، لەناو هەموو گەڵباغی و مەنمیدا لەم ڕووەوە ڕاست بوو قیبلەی هەموو لایەکیان بوو. هەر حسابێك ئەو لێکی بدایەتەوە وا

دەرئەچوو؛ بەو بۆنەوە گەلێ پرس و ڕایان لە دەست ئەوا بوو.

کە شەریفوددەولە چووە وڵاتی سنە ئەم قیبلەی عالەمە وتی: «ئیتر ئەستێرەی ئێمە لە لێژیدایە». پێش ئەوە کە «عەزیز» و «تەکش» بگیرێن، قیبلەی عالەم خەبەری دا کە دەوروبەری کێوی «زێڕاوا» زۆر بە تاریك ئەبینم. ئەستێرەی عەزیز و تەکشم بەرچاو ناکەوێ. لە ڕاستیدا عەزیز و تەکش کە دوو برا بوون و ناوبانگی ئازایەتییان دەرکردبوو لەو شەڕەدا گیران و تیرباران کران.

پێش لە ناوبردنی عەزیز و تەکش خەبەریان دایە کە عێلجاڕی عەشایری ڕەوانسەر و لهۆن بە پشتیوانی حوکومەتی عەجەم لەوانەیە گەڵباغی و مەنمی لەناو بەرن. هەرچەندە ئەم لەشکرە لەشکرێکی زۆر بوو، هەرچەندە جەنگێکی گەورە لە کێوی «تەورێزخاتوون» و «عەباس بەگدا» بوو، بەڵام قیبلەی عالەم پێی وتن: لەم جەنگەدا تا گەڵباغی و مەنمیتان هەس، خەمتان نەبێ سەر ئەکەون. لە ڕاستیدا لەگەڵ ئەو هەموو عێلجاڕەش کە لێیان کرا وەکوو ئەو وتی، هەر سەرکەوتن.

ڕۆژگار هەر کەتنی بە گەڵباغی و مەنمی ئەدا، قیبلەی عالەمیش یەکە یەکە ئەمانەی باس ئەکرد. ساڵی (١٩١٩) هات وتی: «ئەم ساڵە زۆر شوومە. ساڵی (١٣٣٨)ی هیجری ساڵی قڕانی گەڵباغی و مەنمییە».

کە دامودەزگای شەریفوددەولە بەهۆی کوڕەکانی دەوروبەریەوە پەرەی سەند، قیبلەی عالەم چوو بۆ سەقز بۆلای «غیاث الدوله». ئەو چوونەی ئاخر نەگبەتییەك بوو کە ڕووی تێ‌کرد؛ واتە قیبلەی عالەم لەوێ گیری خوارد. لە ئەنجاما ئەو وە ئەوانەی کە گیریان خوارد و کەوتنە ناو داوەوە بە بەندی هێنران بۆ سنە. لە یەکەم شەوی مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٣٣٨ی هیجری لە بەندیخانەی سنە بوو، هەژدە کەسی‌تر لە هاوڕێکانی لەگەڵی

بوون، دەوریان لێ‌دا و وتیان: «قیولە چۆن ئەوینی؟» وتی: «کوڕگەل ئەگەر سۆزی نەکوژرگێین هەسارەی ئێمە تا هەزار ساڵی‌تر ها وە ئاسمانەوە». بەڵام کە کەوتنە سبەینێ هەموو بە تیربارانکردن و بە چاڵنان و بە خنکاندن کوژران. لەشەکانیان لەبەر دەرماڵا خرانە ناو دیوار و هەریەکە بەردێکیان خستنە سەر و ناو و نیشان و کردەوەیان لەسەر بەردەکە هەڵکەند. کوژرانی ئەمانە دوو حەفتەی خایان، بەڵام قیبلەی عالەم لە یەکەم ڕۆژدا تیرباران کرا. ئەوانەش کە لەو چەند ڕۆژەدا کوژران بۆ ئاگاداری مێژوو ئەمانە بوون:

لە گەڵباغی: ١ـ ئاغەبراخان ـ قیبلەی عالەم. ٢ـ سەرداری کوڕی قەیتوول. ٣ـ فارس‌خانی ڕەئیس. ٤ـ محەمەدخانی ڕەئیس. ٥ـ میرزا عەولای «سَیفُ العَشایر».

لە مەنمی: ١ـ فەرەج‌خان. ٢ـ عەوڵاخان. ٣ـ مەحمووبەگ. ٤ـ عەوڵابەگی کوڕی شامحەمەد بەگ. ٥ـ سەید حەمەدخانی سەرهەنگ. ٦ـ مەلیك محەمەد خان. ٧ـ نوورمحەمەد خانی ئێلخانی. ٨ـ مستەفابەگی کوڕی حەمەدبەگ.

لە شێخ سمایلی: ١ـ عەزیزخانی برای مەحموو خانی سەردار ئیقباڵ. ٢ـ مستەفاخانی برای حەمەدمرادخانی ئێلخانی. ٣ـ مەجیدخانی کوڕی سارم لەشکر. ٤ـ مەحمووخانی سەردار ئیقباڵ کوڕی حەمەمراد خان.

ئەمانە بەم جۆرە لەناو بران. لەو ڕۆژەدا زۆر کەس لە کوردەکان بۆ بردنە پێشەوەی خۆیان هاوکارییان لەگەڵ شەریفوددەولەدا ئەکرد. ئەو شەریفوددەولەیە کە بە تاقە زەلامێ لەلایەن حوکومەتی قاجارییەوە هاتە سنە، ئەو حوکومەتی قاجارییە کە تەنها دەنگی هەبوو، ڕەنگی نەبوو.

من لایەنگری ئەو کەسانە ناکەم کە پیاوخراپ و خراپەکارن، سەرۆکەکانی گەڵباغی و مەنمی ماڵی گەلێ کەسیان وێران کرد، گەلێ تاڵانیان کرد،

گەلێ ژنیان بێوەژن کرد و منداڵیان هەتیو خست، بەڵام ئەمانە هەمووی لە ڕووی نەزانی و بێ‌خاوەنییەوە بوو. ئەگەر خاوەن و ڕێ‌پیشاندەرێکی ببوایە وا بەو جۆرە دەرنەئەچوون. جارێکی‌کە دایکێکی‌تر کوڕێکی وەکوو عەزیز و تەکش ناهێنێتەوە. ئەگەر کوردەکە خۆی خۆخۆری نەکردایە ئەو کوڕانە بە پیاوێکی وەکوو شەریفوددەوڵە لەناو نەئەچوون. سەیرەکە ئەوەیە کورد خۆی گەڵباغی و مەنمی لەناو برد، کەچی ئازایەتی و پیاوەتییەکە درایە پاڵ شەریفوددەولە. کوردەکە ئافەرینێکی شەریفوددەولەی کردە تاجە گوڵینەیەك و کردیە سەری، کەچی نە تاجەگوڵینەکەی بۆ مایەوە، نە ئەو کوڕە ناودارانە لە مێژوودا. تا ئێستە هیچکەس کوردی لەناو نەبردووە تەنها کورد خۆی نەبێ، کە ئەمەی بە شانازی زانیوە.

وەیا ئەمە ئەگەر بەدبەختی و ماڵوێرانی نەبێ بۆ کورد، چ ڕەوای هەقە کە خەلیل‌خانی «نەڕان»ی بە قسەی شەریفوددەولە بۆ شاڵێکی تورمەی خەڵاتی، سێ برای بڕبڕە پشتەی خۆی وەکوو سنجەرخان و ئەحمەدخان و یەدوڵلاخان لە ڕۆژی هەینی ١٠ای موحەڕڕەمی (١٣٣٩) ی هیجری لە ماڵی خۆیدا بکوژێ؟ کێ بکوژێ؟ سنجەرخان بکوژێ. کام سنجەرخان؟ ئەو سنجەرخانە کە وەکوو کێوێکی پۆڵایین لە ڕووی ڕووسی قەیسەری و حوکومەتی قاجاریدا وەستابوو. فۆلکلۆرەکانی ئەو ڕۆژە کە بۆ کوژرانی سنجەرخان لە «میاوەران» و «نەڕان» و «سنە»دا ئەوترا، لام وایە وەچەکانی ئێستە و وەچەکانی دوای ئێستەش هەر بەسەر زاریانەوەیە و بەسەر دەمیانەوە ئەبێت. هیچی‌تر گوزارشت لەمە ناداتەوە، تەنها ئەوە نەبێ کە ئەڵێ: «ئەگەر دار پوازی لە خۆی نەبێ ناقەڵشێ».

١٤٤. فارس‌ئاغا هەبوو خەڵکی سولەیمانی بوو بۆی گێڕامەوە وتی: لە پێش شەهید کردنی شێخ سەعید لە (١٩٠٩) لە مووسڵ، هەر

لەگەڵ «شێخ مەحموودی مەلیك» بووم. هەموو جۆرە چەوسانەوەیەکی شەڕم چاوپێ‌کەوت؛ چ لە پیران و نژمار، چ لە تەلان و جاسەنە. وتی: (١٩١٨) لە سنە بووم یەکەم فڕۆکەیەك کە هاتە ئەو شارە یەکەمجار بوو من و ئەوانیش چاومان پێ بکەوێ. هەموو خەڵکی سنە بەهۆی دەنگەدەنگ و گرمەگرمەکەیەوە کردیانە سەر بانەکانا و سەیری ئاسمانیان ئەکرد؛ چونکە گرمەگرمەکە لەوێوە ئەهات هیچیشیان بەرچاو نەئەکەوت، هەر ئەوەندە بوو ئەیانوت ئەوە تەیارە و باڵۆنە هاتووە. لە ئەنجاما چاو تیژەکان شتێکیان بەسەر ئاویەرەوە چاوپێ‌کەوت کە دەنگەکە لەوەوە ئەهات. ئەوەندە بەرز بوو بە عاستەم بەدی ئەکرا. ئەوانەی کە چاویان پێ‌کەوتبوو پیشانی ئەوانی‌تریان ئەدا ئەیانوت: «ئەها ها، ئەوەسە وەکوو داڵ تێت و ئەچێ، تواشاکە تواشاکە چۆن باڵەکانی لار ئەکاتەوە هەر ئەیژی داڵە». خەڵکەکەی‌تریش ئەیانوت: کوا خۆ دیار نییە، ئەوانیش ئەیانوت: «ئەوە نییە دووکەڵ لە جووچکەکەیەوە دەرئەچێ ئەیژی مارێکی ڕەشە و بە ئاسمانا کێشیاگە». وتی: منیش لە ئاخرا چاوم پێ‌کەوت، لە ڕاستیدا ئەوەندە بەرز بوو هەر بە ئەندازەی قەلەڕەشێك ئەهاتە بەرچاو.

وتی: لە (١٩٢٢)یش دواوە کە لە ئەشکەوتی حاسەنە بووین، کاتێ کە تەیارە ئەهات بەسەر ئاواییەکانا هەر سەگ بوو ئەیقرووقان و خۆی ئەشاردەوە. پشیلە باریك ئەبووەوە ئەچووە ناو کادان و شتە. مریشك و کەڵەشێر هەڕایان ئەکردەوە بۆ کولانەکەی خۆیان، باڵندە و چۆلەکە لەسەر دارەکان بەیەکا ئەهاتن، نەیانئەزانی لە ترسا ڕوو بکەنە کوێ! خۆ گا و گۆتەڵ و مەڕ و ماڵات خوا ئەیزانێ چۆن ئەڕەوینەوە، ئێستر و ولاغی بەرزە هەریەکە بە لایەکدا هەڵئەهاتن.

◈◇◈

# پەندی پیران

١٤٥. لەو شارەزوورە لە ئاوایی «بەکراوا» پیاوێکی زۆر بە سامان و بە مەڕومالاتی لێبوو، ناوبانگی مەڕومالاتەکەی ئەو ناوەی پڕ کردبوو. ئەم پیاوە وەکوو وەجاخی کوێر بوو، چرووکییەکەشی لە زۆری سامانەکەی زیاتر ناوبانگی دەرکردبوو. خوا مەرگی پشیلەی کوێری بەکراوای ئەدا ئەگەر بیتوانیایە پرزۆڵەنانێکی «دۆسکە بەکراوایی» لە خەوا ببینیایە.

کاکە دۆسکە، گەلێ شەو و ڕۆژ و وەرزی بەسەرا هات، هیچ نەبوو. کوتوپڕ ڕۆژێك ژنە گیرخواردووەکەی بە دەستیەوە مرخی پەڕایە سەر جەرگ و دڵ. مرخێکی وا کە دڵی بۆ ئەتوایەوە، وەیا ڕاستەوڕاست بڵێین: بێزووی کرد بە سیوجگەرەوە. بە دۆسکەی مێردی وت: پیاوەکە ئەوەی ڕاستی بێ بێزوو ئەکەم بە سیوجگەرەوە، با گیسکێك سەر بڕین، تۆزی لە سیوجگەرەکەی بخۆم، بەڵکوو خوا منالێکیشمان بداتێ. دۆسکە وتی: ئافرەت، گیسك بۆچ سەر بڕین؟ ئەم گیسکە سبەینێ ئەبێ بە «چتیر» ئەیفرۆشین، بە پارەکەی هەزار کونی پێ ئەگرین. خوا ڕێکی خا، سبەی دوو سبەی ئەچم بۆ شار جەرگ و دڵێك لەوێ ئەکڕم و ئەیهێنمەوە ئەوەندە بخۆ تا لە لووتت دێتەوە.

دۆسکە بەم جۆرە ژنەکەی خلافان و لە دەمەدەمی پاییزا ڕوو بە شاری سولەیمانی بەڕێ کەوت بۆ سیوجگەر کڕین. چووە بەر دووکانی

قەساب، سیوجگەرێکی کۆنی چاوپێکەوت وتی: ئەمە بە چەند؟ کابرای قەساب وتی: بە دوو «قڕان». ئەم وتی: بە قڕانێك. کابرای قەساب بە گاڵتەوە پێی وت: برا بچۆ لە کەرکووك بیکڕە بە قڕانێك.

لەم قسەیە کابرا گوێی زرنگایەوە لە دڵی خۆیا وتی: بۆچ نەچم لە کەرکووك بیکڕم بە قڕانێك و قڕانەکەیتری هەزار کونی پێ ئەگرم. پێی لێکرد بە پشتا بۆ کەرکووك. لە پاش چەند ڕۆژ گەیشتە کەرکووك؛ چووە بەر دووکانی قەساب بۆ کڕینی سیوجگەر دانەیەکی بە قەنارەکەوە دی وتی: بە چەند؟ کابرا وتی: بە سێ قڕان وتی: ئەوە چی ئەڵێی تۆ؟ لە سولەیمانی ئەیانوت دوو قڕان. کابرای قەساب وتی: جا کەواتە بچۆ بۆ مووسڵ لەوێ بە دوو «مەتالیك»ـە. کابرا لە دڵی خۆیا لێکی دایەوە ئەگەر بچێ بۆ مووسڵ و ئەم سیوجگەرە بکڕێ بە دوو مەتالیك، لە قڕانەکە دوو مەتالیکەیتری بۆ ئەمێنێتەوە، هەزار کونی پێ ئەگرێ. وای بە باش زانی ڕووەو مووسڵ بەڕێ کەوێ.

بەڕێ کەوت و لە پاش چەند ڕۆژێکیتر گەیشتە مووسڵ. چووە بەر دووکانی قەساب و مامەڵەی سیوجگەری کرد، کابرای قەساب وتی: بە چوار قڕان. وتی: ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ لە کەرکووك ئەگەر کەیفم لێ بوایە بە دوو مەتالیك ئەم کڕی. کابرای قەساب وتی: بچۆ لە حەڵەب بە مەتالیکێك بیکڕە و بچۆرەوە. کابرا قسەکەی بەدڵ بوو وتی: ئەچم لە حەڵەب ئەیکڕم و مەتالیکەکەیتری هەزار کونی پێ ئەگرم. ئەمجا حەڵەب بگرە و هاتم. دەمەو ڕۆژاوا بوو گەیشتە ناو شاری حەڵەب و هیچ شوێنێك شك نابا ئەو شەوەی تیا ڕۆژ بکاتەوە. بەلای کۆشکێکا ڕۆیشت، پەناگەیەکی تیا بوو وتی: ئیمشەو لە پەناگای ئەم کۆشکەدا ڕۆژ ئەکەمەوە و بەیانی ئەچم سیوجگەرەکە ئەکڕم و بەرەو وڵات ئەبمەوە. چوو لە بن

دیوارەکەدا کزۆڵەی کرد.

زۆری پـێ نەچـوو کوڕێکی لاوی شۆخوشـەنگ هـات، ڕووبەڕووی دەروازەی کۆشـکەکە، لـەو کاتەدا کە ویـستی بچێتـە ژوورەوە، چاوی بە تارماییـەك کەوت لە بن دیواری کۆشـکەکەدا. هـات بەلای تارماییەکەوە سەیری کرد زەلامێکە کزۆڵەی کردووە. وتی: کابرا تۆ چیت؟ وتی: قوربان غەریبم، تازە ڕێم کەوتۆتە ئەم شـارە، شـەوم بەسـەرا هات. هیچ شوێنێ شـك نابـەم ئەمـەوێ ئیمشـەو لـەم بـن دیـوارە سـتار بگـرم و بەیانی بچم بەشـوێن ئیشـی خۆمەوە. کوڕە گەنجەکە وتی: برا ئەم کۆشـکە ماڵی منە هەستە ژوورەوە ئیمشەو میوانی من بە و بەیانی خوات لەگەڵ.

کابـرا لەگەڵـی چـووە ژوورەوە، سـەیری کرد بەڕاسـتی کۆشـکێکی زۆر بەتفاقـە. ژنێکـی نازدار هـات بـە پیریانـەوە. بـە دەمێکـی بەپێکەنیـن و ڕوویـەکـی خۆشـەوە لـە کوڕەکـەی پرسـی: ئەو پیـاوە کێیـە لەگەڵتا؟ کوڕە وتی: ئەمە ئیمشـەو میوانمانە. ژنە ئەوەندەیتر ڕووی گەشایەوە و وتی: یاخـوا بەخێـر بێـت! کـوڕەش بە پیاوەکـەی وت: ئەمە ژنمـە. ژنە نانێکی باشی دروست کرد و هەرسێکیان نانیان خوارد.

کابرا سەیری کرد هەر لەو ژوورەدا گۆڕێکیشی لێیە، ئەمە زۆر سەرنجی ڕاکێشا، ئێجگار کە سەیری ئەکرد ئەم ژن و پیاوە لە کاتی نانخواردنەکەدا سەیری گۆڕەکە ئەکەن و بزەیان لێوە دێت!.

پاش نان‌خواردن و هەموو شتێك، ژوورێك لە تەنیشت ئەو ژوورەوە بوو، ژنەکە نوێنێ بۆ کابرای میوان لەوێدا ڕاخست و کوڕەکە پێی وت: کاکـی خـۆم، ڕەنگبـێ هیـلاك بیـت، بچۆ ئـەوە لـەو ژوورە نوێـن ڕاخراوە بحەسێرەوە بنـوو. کابـرا چـوو لەسـەر نوێنـی خـۆی ڕاکشـا و هەر سـێ و دووی ئـەو گـۆڕ و بزەیـەی ئەکـرد. دەلاقەیـەك لە ژوورەکـەدا بوو هەردوو

ژوورەکەی ئەنووسان پێکەوە. دەلاقەکە ڕووی لەم بوو زۆری پێ چوو یا نەچوو، ژن و پیاوەکە لایان وا بوو ئەم خەوی لێ کەوتووە، ئەمیش لەبەر پەژارە و ماندوویێتی دڵ، خەو لێی تۆرابوو. هەستی کرد ئەوا کوڕەکە دوو تێلای هێنا و بە ژنەکەی وت: «بکوتین و بیکەین یا بیکەین و بکوتین؟» ژنە وتی: ئارەزووی خۆتە. لەملاوە کابرا کە چاوی بەو تێلایانە کەوت و گوێی لەو قسەیە بوو، بە جارێ ناوکی کەوت و وتی: جارێکی‌کە دیارە من گیان دەرنابەم، ئەمانە بەناوی میوانییەوە بۆیە ئیمشەو منیان هێنا و خزمەتیان کردم، بمکوژن. لەبەر ئەمە لە شوێنەکەی خۆی قوت بووەوە و نەیزانی چی بکا دەرگا و شتەش هەموو داخراوە.

ئەم لەم پەژارەیەدا بوو سەیری کرد کوڕە ڕاست بووەوە دەستێکی کردە گەردنی ژنەکە و ئاڵان بەیەکا. ئەوی پێویست بوو ئارەزووی دڵیان لەیەك وەرگرت. پاش ئەوە هەستان هەریەکە یەکێ لە تێلاکانیان هەڵگرت و چوونە ئەملاوئەولای گۆڕەکەوە بە دار هاتن بە وێزەی گۆڕەکەدا تا شل بوون. پاش ئەوە هاتن لەملای گۆڕەکەوە دەستیان کردە مل یەك و نوستن.

کوڕەی میوانی خەو بەچاو نەچوو، لەم کارەسات و بەسەرهاتە ئەوەندەی واقی وڕ ما، ئەوەندەی‌تر کەوتە گێژاوی سەرسامییەوە.

ئەو شەوە بە هەرجۆر بوو ڕۆژی کردەوە. بەیانی کوڕەی خانەخوێ ئەوی پێویستی خزمەت بوو دیسان لەگەڵیا بەجێی هێنا و هاتە سەروبەری ڕۆیشتن. کابرای میوان وتی: ئەی ئەو کەسانەی کە بە خزمەت‌کردنەکەتان شەرمەزارتان کردم! من ئیمشەو ئێوە ئاگادار بووبن یا نەبووبن کارەساتێکی وام لە ئێوەوە چاوپێ‌کەوت، ئێستەش بەو نمەکەی کە لەم ماڵەدا کردوومە، لەم ماڵە ناچمە دەرەوە تا بوخچەی ئەم نهێنییەم بۆ نەکەنەوە. کوڕەی خانەخوێ زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: بۆچ تۆ ئاگات

لە کارەساتی ئێمە هەبوو؟ وتی: بەڵێ. وتی: برا واز لەوە بێنە تۆ ئێستە ئەم ماڵە ماڵی خۆتە، ساڵێ لەباتی سەد ساڵ دائەنیشی کەس ڕایەی ئەوەی ناکەوێ پێت بڵێ بڕۆ. کابرای میوان وتی: دەرمانی ڕێگا ڕۆیشتنە، من پیاوێکی غەریبم بە ئیش هاتووم بۆ ئەم وڵاتە، هەر ئەبێ بڕۆم، بەڵام ئەبێ پێم بڵێن.

کوڕەی خانەخوێ وتی: کەواتە گوێ بگرە تا بۆت بگێڕمەوە. وتی: ئا ئەو گۆڕە کە چاوت لێیە پیاوێکی قەسابی زۆر زۆر دەوڵەمەند و وەستای من بوو، گەلێ شوانکارە و ڕانەبێرەی هەبوو. قەسابەکانی ئەم شارە بۆ قەنارەکانیان هەموو کەلەشیان لەو وەرئەگرت. لە پارەش هەتا بڵێیت زۆری هەبوو. ئەو ژنە نازدارە کە ئێستە لە بەرچاوتە و شەوێ لەگەڵ منا بوو، ژنی ئەو بوو. لە ژن و مناڵا لەوە زیاتری نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو سامانەدا کە هەیبوو نە خۆی تێری لە نان ئەخوارد و نە ئەو ژنەی ئاهی سکی لە پێخۆر ئەشکا. کێ یارای ئەوەی هەبوو بتوانێ پێی بڵێ پوولێکی نارەواج بدە بە یەکێ. هەموو ئارەزوو و کۆششێکی کەوتبووە سەر ئەوە هەر ماڵ و سامان کۆ کاتەوە. ژنی بەسەزمانیش کە ئەتوت مانگە، لەبەر برسێتی و بێ‌شتی وەکوو دەمەداسی بە لیمۆی زەرد ئاودراوی لێ هاتبوو. کە ئیشی هەردووکیان گەیشتە ئەم شوێنە کوتوپڕ کابرا مرد. هیچ میراتگری‌تری نەبوو. من ژنەکەیم مارە کرد و لەسەر ماڵەکەیەوە دانیشتم، بەم جۆرە کە تۆ بینیت دەستمان کرد بە کامەرانی.

بە ڕۆژ من ئەچم بۆ سەر کردنەوەی ماڵ و مڵك، ئێوارە کە دێمەوە ئەم ژنە بەو جۆرە دێ بە پیرمەوە و یەکترمان لە گیانی خۆمان خۆشتر ئەوێ. پاش ئەوە کە نان ئەخۆین ئەو قسەیە کە ئەیکەین و ئەڵێین: «بکوتین و بیکەین یا بیکەین و بکوتین»؛ مەبەست ئەوەیە لە پێشا دڵ

لە یەك وەربگرین و ئەمجا بکەوینە کوتانی ئەو گۆڕە کە هی قەسابی وەستای من و کۆنە مێردی ئەوە، وەیا لە پێشا ئەو بکوتینەوە و پاشان ئێمە بەدڵی یەك بگەین!.

قەبرەکەی ئەکوتین ئەڵێین: ئەوە دەردت بێ، «ماڵی خۆنەخۆر بۆ چەکمەبۆرە»؛ تۆ ماڵی خۆتت نەخوارد یەکێکی‌تر ئەیخوا. هەر لە بەرچاوی ئەوەوە لەگەڵ ژنەکەیا ئەئاڵێین بەیەکا. ئەڵێین: بە کوێرایی چاوت بۆ خۆت سەیری ئەم ئاهەنگەی ئێمە بکە. ئێستە ئێمە لەسەر ئەو سامانەی ئەو کە لە کاتی خۆیا هیچی لێ نەخوارد، ئەوی شایانی ژیانێکی شاهانە بێ، ڕایئەبوێرین و چۆن دڵمان بیەوێ وا ئەکەین. ئەمە بوو سەرگوزەشتی ئێمە.

کابرای میوان لە پاش بیستنی ئەم قسە و بەسەرهاتە تاسێك بردیەوە و کەوتە عالەمێکی‌ترەوە. هەر هەستا ماڵاوایی کرد و وتی: زۆر سوپاستان ئەکەم. هاتە بازاڕ، ماینێکی کەحێلەی کڕی سواری بوو، بە چوار ناڵەوە بەرەو بەکراوا بووەوە. بە چەند ڕۆژێکی زۆر کەم گەیشتەوە ماڵەوە، هەر لە دوورەوە بانگی کرد: ئافرەت ئا ئەو مەڕە پەرەکە بدەن بە زەویدا و سەری بڕن. ژنەکەی لە بیستنی ئەم قسەیە هەروا حەپەسا، چونکە ئەمە دۆسکە نییە قسەی وا بکا. دۆسکە وتی: ئافرەت بۆ ڕاماوی نان و خوانێکی باش دروست کە تا دێمەوە. دانەبەزی چوو بۆ ناو ڕان، برە مەڕێکی لادا و دای بە یەکێ لە شوانەکان وتی: هەر خێرا بیانبە بۆ شار بیانفرۆشە. پارەکە بدە بە جلوبەرگ و نوقڵ و نەبات هەر زۆر زوو وەرەوە. شوانەش دیسان هەر حەپەسا. ئەمجا هاتەوە بۆ ماڵەوە و دابەزی وتی: ئافرەت دەوارێك هەڵدەن ئەم دەوارە ئەبێ ببێ بە دیواخان، نابێ هیچ ژەمێك تا من ماوم بێ میوان بێت، تۆش تا ماویت دڵت چی ئەوێ بێ‌دڵی خۆت مەکە،

ماڵ و سامان زۆرە.

ژنە وتی: پیاوە چی قەوماوە؟ من بۆ سیوجگەرە بۆگەنیوێك ئەچووم بە ئاسمانا، ئێستە چییە؟!

وتی: ژنە دەنگ مەکە «تۆ گێ و من کوت پەیدا بووە»؛ نە تۆ ئەدەم بە «قسپ»ـا و نە خۆم ئەدەم بە لێدان. قەمتەری شەیتان لە دەما بوو، ئەوا ئێستە دەرهات و خوا دەرووی لە هەردووکمان کردەوە. چی بەسەرهات لە ئەم شار و ئەو شار، بەو شوێن سیوجگەرەوە و لە چاوپێکەوتنی کارەساتی تازە مێردی کۆنەژنی قەسابەوە و لە دارکاری کردنی قەبری ڕەقوتەقی کابرای ماڵ خۆنەخۆرەوە، هەمووی بۆ گێڕایەوە و وتی: با ئێمە وامان بەسەر نەیێ؛ تا ماوین خۆمان بیخۆین!.

١٤٦. لە ماردین کڵێسەیەکی گاورەکان هەبوو، مەنارە بەرزە جوانەکەی، سەری بردبوو بە ئاسمانا. لەناو مەنارەکە «بۆڵ»ـێکی گەورە هەبوو حاجیلەقلەقێك فێر ببوو ئەچوو بەسەریەوە ئەنیشتەوە و ئەو ناوەی پڕ ئەکرد لە ڕیقنە. مجەوری کڵێسەکە هەموو جار ئەچوو زەنگەکەی ئەشت و دەوروبەرەکەی پاك ئەکردەوە، زۆری پێ نەئەچوو دیسان حاجیلەقلەقەکە پیسی ئەکردەوە. مجەورەکە لەمە زۆر وەڕز ببوو، لە وزەیا نەمابوو ئیتر پاکی کاتەوە و حاجیلەقلەقەکەشی بۆ نەئەگیرا تا چاری بکا.

ڕۆژێك چوو هەندێ گۆشتی حوشتری پەیدا کرد لەگەڵ کاسەیەك عەرەقدا بردی لەسەر مەنارەکەوە لە تەنیشت زەنگەکەوە داینا. حاجیلەقلەق کاتێ کە هاتەوە سەیری کرد ئاوێکی جوان و گۆشتێکی جوانی بۆ دانراوە لە گۆشتەکەی ئەخوارد و دەنووکی ئەدا لە عەرەقەکە لەویشی ئەخواردەوە. بۆچ لە ئەنجاما مەست نەبێ و نەکەوێتە خوارەوە

مجەورەکەیش خۆی لێ داگرتووە. هەر کەوتە خوارەوە بە دارێکەوە گەیشتە سەری و دەستی کرد بە محاکمەکردنی، پێی وت: «من نازانم تۆ چیت و چ ئاینێکت هەیە؟ ئەگەر موسوڵمانیت عەرەق ناخۆیتەوە، ئەگەر جوولەکەیت گۆشت ناخۆی، ئەگەر گاوریت و بڕوات بە ئایینی عیسا هەیە هەڵنافیرێنی بە زەنگی کڵێسەدا؛ دەرکەوت کە تۆ دین سزیت و هیچ دینێکت نییە». بە دارەکە دای لە مێشکی مێشکی پژان و کوشتی.

.١٤٧ لە چیرۆکی گوێئاگردانی کوردییە ئەڵێ: جارێك کیژە بچکۆلەیەك لەو دەشتە لەلای بەرغەل بوو. سەیری کرد وا شێرێکی زۆر زل کەوتۆتە ناو قەفەزێکی پۆڵایین، ئەنرکێنێ و ئەزرکێنێ و ناتوانێ لەناو قەفەزەکەدا دەرچێت. کچۆڵەکە زۆر بەزەیی پیا هاتەوە کە شێری شای گیانلەبەرانی کێوی بەو جۆرە بە زەلیلی لەناو ئەو قەفەزەدا کەوتووە. چوو بەلایەوە پێی وت: شای گیانلەبەران! ئەگەر لەم بەندە رزگارت بکەم چیم دەربارە ئەکەیت؟ وتی: کیژە بچکۆلەکە ئەگەر رزگارم بکەی تا ماوم «هەڵقەبەگوێ»ـی تۆ ئەبم!. کیژە بە هێواشی دەستی برد و دەرگای قەفەزەکەی لێکردەوە و شێر هاتە دەرەوە تۆزێ خۆی کێشایەوە و ئەمجا هات بەلای کیژەکەوە و چەمۆڵەیەکی بۆ درێژ کرد. کیژە وتی: ئەوە چی ئەکەی؟ شێرە وتی: ئەتخۆم. کیژە وتی: جا ئەمە ڕەوای هەقە من تۆم لەو بەندی دیلیەتییە ڕزگار کرد و کەچی ئێستە تۆ ئاوام تۆڵە ئەدەیتەوە؟ شێرە وتی: هەق نییە، هێز لە سەرووی هەقەوەیە. کیژە وتی: ئەوە بەڕاستتە؟ وتی: بەڵێ بەڕاستمە، خۆ گاڵتە ناکەم، چەند ڕۆژە من بەسراومەتەوە لێرە، ئێستە برسیمە و ئەتخۆم. کیژە وتی: ئەی هەقەکە چی لێهات؟ شێرە وتی: پێم وتی، هەق دروست نەبووە.

کیژە وتی: ئێستە کە هەر ئەمخۆی وەرە شتێکیتر بکەین. وتی: چی بکەین؟ وتی: وەرە پێکەوە بەم ڕێگەیەدا ئەڕۆین، تا تووشی سێ جۆرە گیانلەبەر ئەبین. لێیان ئەپرسین، ئەگەر ئەوانیش وتیان هەق نییە، ئەوا بمخۆ، هیچ لۆمەیەکت ئیتر نایەتە سەر. شێر وتی: باشە.

ڕۆیشتن لە ناکاو تووشی کەروێشکێك بوون. شێرە بە تووڕەییەوە بانگی کرد: کەروێشك هەق هەیە؟ کەروێشك کە سەیری دیمەن و چەمۆڵە و دانە ڕیچەکانی شێری کرد، هێزی تیا نەما و وتی: «قوربان هەق نییە». شێرە وتی: بڕۆ بە ڕێی خۆتەوە. ئەو ڕۆیشت و ئەمان ماوەیەکیتر ڕۆیشتن تووشی ئاسکێك بوون. شێرە بانگی کرد لە ئاسکەکە وتی: ئەی ئاسك هەق هەیە؟ ئاسك کە سەیری گوێچکەی ڕاستەوەبوو و تووکی گرژی سەر و کەللەی شێری کرد، ورەی پێ نەما وتی: «قوربان هەق نییە و هەر دروست نەبووە». شێرە وتی: بڕۆ بە ڕێی خۆتەوە. ئاسکەکە لێی دا ڕۆیشت و ئەمانیش کەوتنەوە ڕێ، زۆر نەڕۆیشتن، تووشی ڕێوییەك بوون. شێرە بانگی کرد: ڕێوی هەق هەیە؟ ڕێوی وتی: قوربان تێناگەم کارەسات چییە، نازانم چی بڵێم. شێرەکە وتی: من لە قەفەزێکی پۆڵاییندا بووم ئەم کیژۆڵەیە بەرەڵای کردم. ئێستە ئەڵێم: ئەتخۆم، ئەڵێ: هەق نییە بمخۆی، منیش ئەڵێم: هەق هەر دروست نەبووە. وا ئەم پرسیارە ئێستە لە تۆ ئەکەم بۆ ئەوە شەرع بکەیت. ڕێوی وتی: شای گیانلەبەرانی دارستان فەرمایشەکەت زۆر بەجێیە، بەڵام شەرعکردن ئەبێ هەردوو کەسەکە چۆن بوون، بەو جۆرە لە بەردەمی قازیدا ڕاوەستن بۆ ئەوەی قازی سەیری سەروباڵای هەردووکیان بکا لە کاتی تاوانا، ئەو وەختە حوکمی عادڵانەی خۆی بدا. ئێستە من نازانم قەفەزەکە چۆن بووە و ئەم کیژە چی کردووە و تۆ چیت پێ وتووە و چۆن دەستی بۆ ئەو قەفەزە درێژ کردووە؟ شێرە

وتی: نەچووە بچێت، وەرە لەگەڵمان با بگەڕێینەوە بۆ سەر قەفەزەکە و بە چاوی خۆت دیمەنەکە ببینە. ڕێوی وتی: فەرموو باشە.

هەموو بەرەودوا گەڕانەوە تا چوونەوە سەر قەفەزەکە. شێرەکە وتی: لەم شوێنەدا بووە و ئەمەش قەفەزەکەیە. ڕێوی وتی: فەرموو بچۆرەوە ناو قەفەزەکە با بە چاوی خۆم کارەساتەکە ببینم. شێرەکە چووەوە ناو قەفەزەکە. ڕێوی وتی: قەفەزەکە هەر وا بەرەڵا بوو؟ شێرەکە وتی: نەء؛ دەرگاکەی داخرابوو. بە کچەکەی وت: دەرگاکەی وەکوو خۆی لێ بکەوە. کچە دەستی برد دەرگاکەی دادایەوە. ئەمجا ڕێوی ڕووی کردە شێرەکە و وتی: فەرموو ئێستە چی ئەڵێی بڵێ؛ وتی: «هەق هەیە یان نە؟» ڕێوی وتی: «بەڵێ هەیە و دروست بووە!». شێرە وتی: هەق نییە، ڕێوی وتی: هەق هەیە و دروست بووە، هەق ئەوە بوو کە تۆ تۆڵەی ئەم کچەی بە چاکە بدەیتەوە، کەچی تۆ هاتی هێزت خستە سەر هەقەوە. بەڵام هەق هەر شوێنی خۆی ئەگرێ و هەر سەر ئەکەوێ؛ ئەگەر بڕوا ناکەی، تۆ بۆ خۆت لەوێدا هەر لە ورگی خۆت بدە!.

**١٤٨.** لە قسەی گوێئاگردانی کوردییە ئەڵێ: مام ڕێوی دەرماڵی شێر، بوو بە خزمەتکار لەماڵیانا و جارجاریش ئەگەر لە پاشماوەی شێر شتێکی دەستکەوێ بیخوا. هەر لەبەر ئەم چڵکاو خواردنە بوو وا چووە ژێر ئەرکی ئەو خزمەتکارییە.

ڕۆژێك شێر ـ شای دڕندەکان ـ پێی وت: بزانم کەس دیار نییە بێت بۆ خزمەتی ئەم بارەگایە؟ مام ڕێوی وتی: فەرمانی پادشا لەسەر سەرە، هەر ئێستە ئەچم ئەم بارەگایە پڕ ئەکەم لە خوڵام و لە نۆکەری کەمەربەستە.

چوو لە ڕێگادا لەو دەشتی «زەنگابات»ـە تووشی ورچ بوو، پێی وت:

دارۆغەی وڵات دوێنێ مردووە، کوێخای زەنگابات شای گیانلەبەران فەرمانی داوە کە ئێوە شوێنی بگرنەوە، فەرموو با بچین بۆ خزمەتی. ورچە بە فیزێکەوە شوێنی کەوت و چوون بۆ خزمەتی شێر.

شێر ماوەیەکە برسییە و زۆر تووڕەیە لەوە کە ماوەیەکە کەس نەهاتووە بۆ خزمەتی. هەر کە چاوی بە ورچ کەوت چەمۆڵەیەکی بۆ درێژ کرد و هەموو پێستی سەر شانی بە جارێ هێنایە خوارەوە تا سەر کلکی دایماڵی. ئەمجا ڕێوی ڕووی تێکرد و پێی وت:

کوێخـــــــای زەنگابـــــــات
هەڵکێشـــــــە عەبـــــات
چەفتەی سەر شانت ئاوەڵدامەنە
ئەو لار و لەنجـەی هەتە دایمەنە
کوێخای زەنگابـات ئەرکی گرانە
شـان هەڵتەکێنـە ڕێـگات بزانە
تۆ لەکوێ و کوێخای زەنگابات لەکوێ
خۆ نەناس ئەبێ بەم جۆرەی بوێ

١٤٩. دیسان هەر لە قسەی گوێئاگردانە ئەڵێ: ڕێوییەك کەوتبووە حاڵی خۆیەوە لە برسانا لات کەوتبوو. بە سەرەتەقێ و لۆکەلۆك کەوتە ئەو دەشتی گەرمیانە بۆ ئەوەی بەڵکوو شتێکی دەستکەوێ، لەو ڕۆژە ڕەشە ڕزگاری ببێ. لە ناکاو تووشی گورگێك بوو سەیری کرد گورگ لەم پەرێشانترە. گورگەکە دانێکی لێ ڕیچ کردەوە و پەلاماری دا، مام ڕێوی تۆزێ بۆی کشایەوە و پێی وت: بێقەزا بی چی ئەکەی؟ لە خواردنی گەڕێکی لەڕی وەکوو من چ ئاهێك ئەکەوێتە سکتەوە؟ بە

قەپاڵێك منت خوارد، دواجار چی ئەکەی؟ وەرە با بچین لەو شیوە ئێسترێك کەوتووە جەنابت لە پێشا تێری لێ بخۆ، منیش لە پاشماوەکەت ئەخۆم، تا ئەو تەواو ئەبێ من بە پوختی قەڵەو ئەبمەوە، ئەو وەختە عافیەتم کە. گورگە وتی: باشە، وا لە کوێیە با بچین.

ڕێوی پێشی کەوت و ڕوویان کردە چەمەکە، سەیریان کرد وا جوانووە ئێسترێکی قەڵەو لەسەر لا لێی ڕاکشاوە. هەر ئێستە عەمری داوە بە تۆ یا ساڵێ لەمەو پێشتر. مام ڕێوی بە گورگەی وت: من لەبەر پیری و لەبەر برسێتی هێزی چاوەکانم نەماوە، بزماری ناڵی سمی ئێسترەکە ئەگەر بەلای ڕاستدا چەوت بووبێتەوە ئەوە ئەو ئێسترە تۆپیوە، ئەگەر بەلای چەپا بێ، هێشتا تۆزێکی ماوە؛ جەنابت سەیرێکی بکە بزانە بە کام لایە؟ بۆ ئەوە ئەگەر نەتۆپیبێ با بتۆپێ و لە خواردنەکەیا جەنابت تووشی عەزیەتی لنگەفرتەکەی نەبی!.

گورگە وتی: باشە و چوو بەلای سمی ئێسترەکەوە، لەو وەختەدا کە سەیری ئەکرد، لمۆزی کەوت لە سمی و ئێستر خەبەری بووەوە و لەقەیەکی کێشا بە مێشکی گورگا، مێشکی کەوتە دەمی و گورگ لەوێ کەوت. ئێستر ڕاپەڕی لێی دا ڕۆیشت. مام ڕێوی چووە سەر کەلاکی گورگ و پێی وت: «مردووت مرێ، تۆ کە ڕەقەم و تاریخت بۆ ناخوێنرێتەوە، بۆچ لە خۆتەوە خۆتی تێ هەڵئەقورتێنی!؟». ئەمجا سەری کردە کەلاکەکەی و دەستی کرد بە خواردنی.

.۱۵۰ لە قسەی گوێئاگردانی کوردییە ئەڵێ: لە تانجییان پرسی: تۆ زۆر خێرا و بەهێزی بۆ ڕاکردن، کەچی گەلێ جار کاتێ کە ئەکەویتە سەر کەروێشك کەروێشکەکەت لە دەست دەرئەچێ؛ ئەمە

بۆچ وایە؟ ئەویش وتی: ئاخر کەروێشك بۆ خۆی ڕائەکا و من بۆ یەکێکی ترا!.

١٥١. لەو وڵاتی «گرگر»ە جارێك کابرایەکی «وەرمەکان»ی کەوێکی نایابی ئەبێ، بە دیاری ئەیبا بۆ «حاجی میرزا مەجید» باوکی «نُصرَت نِظام» لە «مامێزەك». ئەویش چل تمەنی ئەو سەردەمەی بەناوی بەخششەوە ئەداتێ؛ ئەڕوا. پاشان بانگی ئەکاتەوە پێی ئەڵێ: چاکەی ئەم کەوە چییە؟ ئەڵێ: قوربان قەت شتی وا نەبووەتەوە، کە ئەبرێ بۆ ڕاو هەر کە ئەخوێنێ هەچ کەوێك لەو دەورەدا ئەبێ هەموو کۆ ئەبنەوە. پاشان ڕاوچییەکە بە تفەنگی ساچمەزەن هەموویان ئەکوژێ، کەوی وا هەر نەبۆتەوە.

حاجی میرزا ئەڵێ: ها، تێگەیشتم. بە یەکێ لە پیاوەکانی خۆی ئەڵێ: ئەم کەوە سەر بڕە. کابرای کۆنە خاوەنەکەی کلّپە لە جەرگیەوە هەڵئەستێ، تا ئەڵێ قوربان چی ئەکەی؟ پیاوەکە سەری ئەبڕێ، ئەمجا ئەڵێ: «برام ئەم کەوە خۆخۆرە؛ ئەکاتە کارێ کە هاوخوێنی خۆی لەناو بەرێ و ئەبێتە لەناو چوونی جنسی خۆی. هەرکە وابێ ئەبێ لەناو ببرێ».

١٥٢. بە مەیموونیان وت: بۆ ئەوەندە بێدین و لەخوا نەترسی، وەخت و ناوەخت نازانی؟ هەڵئەستی و دائەنیشی ئیشێکی وا ئەکەی هەموو کەس دێنیتە پێکەنین، ئیتر چاوت لەوە نییە ئەگەر یەکێ ئەزیەتبار بوو، وەیا لەناو گێژاوی ماتەمێکا بوو تۆ هەر لەسەر حوللەسێی خۆت ئەڕۆی. ئاخر ناترسی خوا غەزەبت لێ بگرێ؟ ئەویش وتی: «خوا چیم لێ ئەکا؟ مەگەر لەسەر ئەم شکڵە لامبا و بمکا بە ئاسك».



# ولامی بێ وەلام

١٥٣. «هەولێری»ـیێك تووشی «سولەیمانی»ـیەك ئەبێ پێی ئەڵێ: «ئەوە لۆ چی ئەنگۆ بە لۆچی دەرێن بۆچی؟» ئەویش ئەڵێ: «ئەی ئەوە بۆ چی ئێوە بە بۆچی ئەڵێن لۆچی؟».

١٥٤. شێخ مارفی سەعاتچی ئەچێتە ئاودەستی مزگەوتێك نوێژ بکا و قیبلەی لێ ئەگۆڕێ. یەکێ لە کوڕەکانی شێخ قادری گوللەنەبڕ پێی ئەڵێ: «ئەم مەلایانە هەروا ئەبێ ڕوو نەکەنە قیبلە؟».

١٥٥. کابرایەکی پاوەیی چووە بەر ماڵی ئاغایەك بۆ ئەوەی شتێکی بداتێ، سەیری کرد ئاغا خۆی لەسەر تەلاری کۆشکەکەوە دانیشتووە، ئەمیش لە خوارەوە. داوای لێکرد خێرێکی پێ بکا. ئاغاش لە سەرەوە بانگی کرد: «ئا مچە بە خولە بڵێ بە بلە بڵێت کە بە خلەی دەرگەوان بڵێ بەو کابرایە بڵێت: خوا بتداتێ!».

کابرای پاوەیی کە ئەمەی چاوپێکەوت دەستی بەرز کردەوە و وتی: «خوا بە جبرەئیل بڵێ بە میکائیل بڵێ کە بە ئیسرافیل بڵێ بە عیزرائیل بڵێت: گیانی ئەم کابرایە بکێشێ!».

١٥٦. کابرایەکی پاوەیی لە ئەستەمووڵ بە ڕیشێکی پانی ڕێکوپێکی شانەکراو و بە مێزەرێکی خڕی زلی لە دەق دراوەوە، بە عەبایەکی شان سورمەوە تووشی والیزادەیەك ئەبێت، کرنووشی بۆ ئەبا و زۆر بە

ئەدەب و ئیحترامەوە داوای شتێکی لێ ئەکا. والیزادەکەش ئەڵێ: «ئەفەندم، تۆ بەم لاوی و بە شەوکەتی و هەڕەتی جوانیتەوە لام وایە بچیت فرمانێ بکەی بۆ خۆت باشترە لەم حاڵەت».

کابرای پاوەییش هیچ خۆی تێك نەدا و بە ئیحترامی گەلێك لە هەوەڵجار زیاتر ڕووی تێ ئەکاتەوە و پێی ئەڵێ: «بەگ! من هاتووم داوای خێر و دراوێکت لێ ئەکەم داوای فەلسەفە و ئامۆژگاریت لێ ناکەم!».

بەگ ئەفەندی ناچار ئەبێ دەست ئەبا و شتی ئەداتێ.

.١٥٧ لە کرماشان کابرایەك خەریکی دەرۆزەکردن ئەبێ، ئەچێتە بەر دەروازەی کۆشکێکی گەورە، کە ئەم کۆشکە هی پیاوێکی دەوڵەمەندی پاوەیی ئەبێ. تەقە ئەدا لە دەروازەکە و دێن بە دەمیەوە و پێی ئەڵێن: چیت ئەوێ؟ ئەڵێ: ئاغا خۆیم ئەوێ. خەبەر بە ئاغا ئەدەن کە پیاوێك لە بەردەرگا داوات ئەکا. ئەویش لە سەرەوە دێتە خوارەوە بۆ لای کابرا و ئەڵێ: چیت ئەوێ؟ کابراش ئەڵێ: «لە ڕێگەی خودا شتێکم بدەرێ».

ئاغاش پەلی ئەگرێ و ئەڵێ فەرموو. ئەیباتە سەر کۆشکەکە و لەوێ پێی ئەڵێ: خوا بتداتێ».

.١٥٨ مامۆستایەك دەرسی بە منالان ئەوت لێی پرسین: ئایا بەفری قەندیل ساردترە یا هی زۆزان؟ یەکێ لە قوتابییەکان هەستا و وتی: «مامۆستا قسەکەی تۆ لە هەردووکیان ساردترە!».

.١٥٩ مستەفای خەڵکی پیروەیس لەو خوارە لە هاتوچۆی گەرمیانا لە دیوەخانی شێخێکی عەرەبدا ئەبێ، دەست ئەکرێ بە قسەی خۆش و نوکتە گێڕانەوە و باسی زمان و قسە کردن. قسەکانی

مستەفا زۆر سەیر و بە دەنگێکی نێری کوردانە ئەبێ.

یەکێ لە دانیشتووەکان ئەڵێ: کوڕینە ئێوە ئەزانن وەختێ کە خوا قەومەکانی دروست کرد زمانەکانی بەش کرد بەسەریانا و پڕ بە پڕی قەومەکان دەرچوون، پاشان قەومی کوردیشی دروست کرد ئەمان هیچیان بۆ نەمابووەوە هەستان چوونە لای خوا شکاتیان کرد و وتیان: ئەی بەشەزمانی ئێمە کامەیە؟

خوایش وتی: «تازە زمانەکانم بەش کردووە هیچ بۆ ئێوە نەماوەتەوە، هەستن بچن بە سەریانەوە بگەڕێن هەریەکە بەڵکوو تۆزێکی لێ بپچڕن و بیکەن بە زمانێك بۆ خۆتان». ئێستە ئەم زمانی کوردییە ئەو گاڵەگاڵەیە.

مستەفاش ئەڵێ: «بەڵێ ڕاست ئەفەرمووی، کە چوونە لای خوا، خوا فەرمووی: زمانەکان بەش کراون، بەڵام «مێشك»ـم هێشتۆتەوە بۆ ئێوە. مێشکەکە هەڵگرن بۆ خۆتان و سەرگوڵی زمانەکانیش وەربگرن. ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئێوە بەقەد باسکێك زمانتان درێژە و ئێمە گاڵەگاڵمان لێوە دێت». کە ئەم قسەیە ئەکا کابرای بەرانبەری بۆڕ ئەخوا و دیوەخانەکەش ورتەی لێوە نایە.

١٦٠. «رامز یعقوبی» بە قائیمقامی ئەچێتە کۆیە. پێش ئەو جەمیل ئاغا چەند ساڵێك هەر لە کۆیە قائیمقام بوو. ڕامزبەگ پیاوێك بوو سەودای لەگەڵ خواردنەوەدا هەبوو. جەمیل ئاغاش لە نوێژ بەولاوە هیچی تری نەئەزانی.

ڕۆژێك ڕامزبەگ ئەچێ بۆ دیدەنی جەمیل ئاغا، لەو ماوەدا کە دائەنیشێ شتێکی وای دەست ناکەوێ کە بە دڵی بێ و بیخواتەوە، هەروا هەڵئەستێ.

پاش چەند ڕۆژێك ئەمجا شەوێك جەمیل‌ئاغا ئەچێ بۆ دیدەنی ڕامزبەگ، گەلێك دائەنیشێ و شەو درەنگ ئەبێ ئەیەوێ نوێژەکەی عیشای بکا، هەرچەندە چاو ئەگێڕێ شتێکی وای بەرچاو ناکەوێ نوێژی لەسەر بکا، ناچار هەڵئەستێ و عەباکەی خۆی ڕائەخا و نوێژەکەی لەسەر ئەکا و پاشان ئەچێتەوە بۆ ماڵی خۆیان.

بەیانی بەرماڵێکی پوختەی نایاب ئەخاتە ناو بوخچەیەکی تازەوە ئەیدا بە پیاوەکەی خۆی بیبا بۆ ڕامزبەگ. پێی ئەڵێ: کە بە ڕامزبەگ بڵێت: جەمیل‌ئاغا ئەم «دووگورد»ەی بە دیاری بۆ ناردوویت بۆ ئەوە ئەگەر جارێك یەکێکی وەکوو من بوو بە میوانت با نوێژی لەسەر بکا.

پیاوەش ئەچێ و دیارییەکە و ڕاسپێرییەکە ئەگەیەنێ بە ڕامزبەگ. ڕامزبەگیش وەری‌ئەگرێ و بە پیاوەکە ئەڵێ: تۆزێ دانیشە. خۆی ئەچێتە ژوورەوە سندووقێك پڕ ئەکا لە شەمپانیا و وێسکی و بیرە و عەرەقی زەحلاوی، ئەیهێنێ و ئەیدا بە پیاوەکە و پێی ئەڵێ: کە بە جەمیل ئاغا بڵێت: «ڕامز ئەم سندووقە خواردنەوانەی بە دیاری بۆ ناردوویت، بۆ ئەوە ئەگەر جارێك یەکێکی وەکوو من بوو بە میوانت بۆی دانێی با بیخواتەوە!».

**١٦١.** لەو سەرە کابرایەك تووشی پەتایەکی زۆر پیس بووبوو، چووە لای حەکیمەکە داوای دەرمانی لێ‌کرد بۆی. ئەویش پێی وت: بچۆ هەندێ «سرکەی حەوساڵە» بخۆ یەکەوجار چاك ئەبیەوە.

کابرا چوو، هەرچەند گەڕا سرکەیەکی وای دەست نەکەوت؛ لە ئاخرا ناونیشانیان دایە کە لەلای کوێخاکەی دێی «گروێس» دەست ئەکەوێ. ئەویش چوو پێی وت: کە ئایا سرکەی حەوت ساڵەت هەیە؟ وتی: بەڵێ هەمە. وتی: کەواتە هەندێکم بدەرێ بۆ ئەم پەتایەم. وتی:

بە کەسی نادەم. وتی: بۆچی؟ وتی: «ئەگەر بمدایە بە خەڵك ئێستە لەکوێ سرکەی حەوت ساڵە لای من ئەما!؟».

١٦٢. فەقێیەك هەوای شیعر وتن ئەکەوێتە سەری و چەند شیعرێك دائەنێ و ئەیبا بۆ شێخ ڕەزا کە تەماشای بکا و پەسندی بکا. شێخ کە سەیری ئەکا سەرێکی بۆ با ئەدا و ناشیەوێ دڵی فەقێکە بشکێنێ، پێی ئەڵێ: خراپ نییە. فەقێ ئەمەی زۆر پێ خۆش ئەبێ ئەڵێ: دەسا قوربان ئەبێ ئەوەش بزانی کە ئەمە لەسەر ئاودەست دامناوە. شێخیش ئەڵێ: «بەڵێ ڕاست ئەکەی، هەر کە سەیرم کرد ئەو بۆنەی لێ ئەهات!».

١٦٣. شێخ ئیمام هەبوو لە سابڵاخ ـ ماشەڵڵا ـ لووتێکی زۆر زلی پێوە بوو، لەگەڵ ڕیشێکی پانوپۆڕی تەنکدا. ڕۆژێك ئەم ئیمامە ئەچێتە ماڵێك ئەو ماڵە کوڕێکی بچکۆلەی جوانکەلەیان ئەبێ. کوڕەکە لە خزمەت شێخا بە چۆکا دێت و زۆر بە ئەدەب دائەنیشێ و هیچ جموجوول ناکا. شێخ پێی ئەڵێ: «یاڕەبی کوڕم عەمر درێژ بی! ئەوە هەموو دەم تۆ ئاوا بە ئەدەب و لەسەرخۆیت؟ بۆچی باوك و دایکت ئەڵێن هاروهاجە؟» کوڕەکەش ئەڵێ: «نەوەڵڵا قوربان هەموو وەخت وا نیم. ئەوە ئێستا دایکم وتی: سەیری لووتی شێخ ئەکەی دەست نەکەی بە پێکەنین، باشە؟ کرۆتەت دەدەمێ».

١٦٤. کابرایەك قسەی بۆ یەکێکی تر ئەکرد و سوێنی بۆ ئەخوارد کە فلانکەس قسەی پێ وتووی. یەکێکی تر خۆی دابووە پاڵ دیوارێك گوێی لە قسەی کابرا بوو، لەپاڵ دیوارەکە دەرپەڕی و بە

کابرای وت: «سوێنەکەت بکەوێ لەوە باشترە فیتنەیی بکەی».
ئەویش خێرا پێی وت: خۆ داگرتنەکەی تۆ لە فیتنەییەکەی من خراپترە.
ئەمیش گورج وتی: کەواتە هیچمان لە هیچ.

١٦٥. «مەلا محەمەد»ێکی تاڵ هەبوو جارێك بە شێخ بابەعەلی تەکیەیی ئەڵێ: قوربان دەرسی «ابن حَجَر»م پێ بڵێ. ئەویش ئەڵێ: کورم تۆ لێی تێ ناگەی. ئەویش ئەڵێ: «قوربان من خوێندنم لە سەرە تێگەیشتنم لەسەر نییە».

١٦٦. جارێك «عزەت بەگی حەمەسالحبەگ» لە هەڵەبجە لە دەمەدەمی بەهارا تووشی شێخ محەمەدی شێخ حیسامەددین ئەبێ و پێی ئەڵێ: «یا شێخ -بێ چاوی بێ- لە بەرچاوم قەڵەو بوویتەوە». ئەویش ئەڵێ: «بەگم! ئێمەمانان ئەگەر قەڵەو بینەوە لە پاییزانا قەڵەو ئەبینەوە، هی وەکوو جەنابت لە بەهارانا قەڵەو ئەبێتەوە».

١٦٧. «شێخ ڕەزا» جارێك ئەچێتە سولەیمانی هەندێ لە ناحەزەکان ئەیانەوێ ئیشێکی وای لەگەڵ بکەن کە لەناو خەڵکا بیشکێنن و حەیای بەرن. هەتیوێکی لێ تاو ئەدەن کە شوێنی کەوێ. هەتیوە ئەچێ لەناو کۆڕێکا ئەیگرێ و ئەڵێ: «یاشێخ لەبیرتە کە پێرێ شەوێ یەخەت گرتبووم ئەتویست خراپم بکەیت و من هەڵاتم».

١٦٨. سەیدێکی عەرەبی بەغدایی لە سولەیمانی بوو ناوی «سەی حەنتۆش» بووە. خۆت ئەزانی لەو وڵاتە ئەگەر یەکێ بە عەرەبی قسەی بکردایە و زمانی ئەو زمانە بوایە لەسەر دەست ڕائەگیرا. ئەو کەسە ئەوەندە بە چاوێکی بەرزەوە سەیر ئەکرا، لەوانە بوو لە خۆی

بایـی ببـێ. کەسـێ پێشـی نەئەکـەوت و لـە هەمـوو دیواخانێکا لـە ژوور هەموو کەسێکەوە دائەنیشت.

ئەم سەی حەنتۆشە لەبەر ئەوە زمانەکەی عەرەبی بوو، بەربەرەکانێی لەگەڵ هەموو کەس ئەکرد و ئەوانەی زۆر شارەزا نەبوونایە ئەیانوت ئەمە هەمووی حەدیسی پێغەمبەرە ئەم ئەیفەرموێـت؛ چونکە بە زمانی ئەو قسە ئەکا. لەمەوە وای لێ هاتبوو ئەمجا بەربەرەکانێی قورئانیشی ئەکرد.

ڕۆژێك لەلای شێخ بابەعەلی تەکیەیی دائەنیشێت و ئەڵێ: خەڵك ئەڵێن هەموو قورئان فەسیحە؛ ئەمە وا نییە. شێخ بابەعەلی ئەڵێ: کام شوێنی فەسیح نییە؟ سەی حەنتۆش ئەڵێ: ئەو ئایەتە کە لە باسی میراتا قسە ئەکا و ئەڵێ: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾؛ واتە بۆ پیاو دووبەرابەری ژنە.

شێخ بابەعەلی ئەڵێ: جا نافەسیحی ئەم ئایەتە چییە؟ وە ئەبوا بە خەیاڵی تۆ چۆن بێت؟ سەی حەنتۆش ئەڵێ: ئەگەر بیوتایە: «**للأُنْثىٰ نِصْفُ الذَّكَرِ**» باشتر بوو.

شێخ بابەعەلی بەبێ وەستان ئەڵێ: «ئاخر ئەو وەختە دایکت ئەیوت کەمە!». سەی حەنتۆش ئیتر ڕەپ ڕائەوەستێ.

**١٦٩.** شێخ ڕەزا جارێك ئەچێتە سولەیمانی بەناو کۆڵانێکا تێ ئەپەڕێ چەند ئافرەتێکی جوان و بەدیمەن لە پێشەوە ئەبن. شێخ پێیان ئەڵێ: «خۆتان لادەن با من بڕۆم چونکە بەناو ژنانا ڕۆیشتن کەراهەتی هەیە».

یەکێ لە ئافرەتەکان سەروسەودادار ئەبێ ئەڵێ: بەڵێ باشە شێخ، بەڵام ئایا وەختێ کە هاتیـە دنیاوە لەناو ژنەوە نەهاتیت؟» شێخ ئەڵێ:

«بەڵێ، بەڵام وەختێ کە من لەناو ژنەوە هاتمە دەرەوە وا بەم جۆرە گوشاد نەبوو؟»!.

١٧٠. کابرایەك ئەچێتە لای «کاکەحمەد»ی سولەیمانی ئەڵێ: «قوربان کۆڵنجم کردووە هاتووم نووشتەیەکم بۆ بکەیت بەڵکوو لە کۆڵم کەوێ؛ ئەم مەجیدییەشم هێناوە بۆ سەرقەڵەمانە». کاکەحەمەدیش بەبێ ئەوەی هیچ خۆێ تێك بدا دەست ئەبا مەجیدییەك ئەخاتە سەر مەجیدی کابرا و پێی ئەڵێ: «کوڕم بچۆ بەم دوو مەجیدییە سوخمەیەکی ناودار بکڕە و لەبەری کە، کۆڵنجەکەت لە کۆڵ ئەکەوێ».

١٧١. شێخ ڕەقیب هەبوو لەو وڵاتی «ئاکرێ»یە. ئەم شێخ ڕەقیبە خواردنی هەر گۆشتی برژاو بوو. خولامێکی هەبوو هەر بە دوو ڕۆژ بەرخێکی بۆ سەرئەبڕی و بۆی ئەبرژان و ئەویش بە پوختی ئەیخوارد.

ڕۆژێك شێخ ڕەقیب خەریکی خواردنی گۆشتی برژاوی بەرخی ئەو ڕۆژە ئەبێت، لە گەرووی ئەگیرێ و هەرچەند ئەکا ناچێتە خوارەوە. خۆلامەکەی بانگ ئەکا و دەست ئەکا بە جنێودان پێی. ئەڵێ: تۆ ئیمڕۆ گۆشتەکەت باش نەبرژاندووە ئەوەتە ئەگیرێتە گەرووم. ئەویش هەرچەند ئەڵێ: یا شێخ باشم برژاندووە هیچ ناتەواوییەکی نییە، کەڵکی ناگرێ. شێخ هەر جنێوی ئەداتێ و بە دەمیشیەوە لە حەیبەتانا ئەکۆکێ.

ئەمجا خۆلامەکە ئەڵێ: «بەخوا یاشێخ زۆر چاکم برژاندووە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم بەرخە ـکە من ئیمڕۆژم سەر بڕی ـ ماڵی حەڵاڵ و بێغەشی خۆت بووا!».

١٧٢. حاجی مەلا ئەوڕەحمانی شەرەفکەندی ڕۆژێك لەگەڵ سەید سەعیدی باخەوان لە «شەرەفکەند»ەوە ئەچن بۆ خانەقای

شێخی بورهان. لە ڕێگا، حاجی مەلا بە سەید سەعید ئەڵێ: دەوەرە سەید دوو قسەی خۆش بکە با ڕێگەکەمان لەبەر بڕوا. سەید سەعید خەریک ئەبێ گەرووی پاك ئەکاتەوە، کەچی لە ناکاو تڕێك ئەکەنێ. بەمە زۆر تێك ئەچێ و لە شەرمەزاریدا سەر دائەخا و نقەی لێوە نایەت. حاجی مەلاش هیچ دەنگ ناکا و کارێکی وا ئەکا کە سەید سەعید وا بزانێ ئەم گوێی لە هیچ نەبووە.

هەندێك هەردووك بە بێدەنگ بە ڕێدا ئەڕۆن، لە پڕ سەید سەعید ئەڵێ: ئەرێ حاجی مامۆستا بۆچ هیچ فەرمایشێك نافەرمووی؟ حاجی مەلاش ئەڵێ: «بەخودای بابەلێ زۆریشم نقاندووە، هەرچەندە دەکەم وەك تۆ فەرمایشم نایەت».

١٧٣. سەید حەسەنی موفتی لە سولەیمانی ئەیەوێ ژنێکیتر بێنێت. لە دواییا «حەبەخان»ـی کچی شێخ عەلی «عەبابەیلێ»ـی بۆ ئەدۆزنەوە و ڕێ ئەکەون. تاقمێ سوار لە سولەیمانییەوە ئەچن بۆ گواستنەوەی حەبەخان. لەولاوە سوارەی عەبابەیلێش لەگەڵ بووکا دێن بۆ سولەیمانی. شێخ عەلیش پیاوێکی ناودار و لەگەڵ مەولەویدا زۆر دۆست بوون. مەولەویش لەبەر ئەو دۆستایەتییەی کە هەیبوو، بۆ ئیحترامی شێخ عەلی لەگەڵ حەبەخانا دێت بۆ سولەیمانی.

لە ڕێگادا «حەسەنی ئامێ» هەبوو گۆینده و دەنگخۆشی ناو ئەو دەستە سوارە ئەبێ، وە بەڵکوو گۆیندەی ئەو دەورە بوو. ڕووی لێ ئەنێن بۆ وتن؛ ئەویش بە مەقامی «ئای ئای» دەس ئەکا بە خوێندنی شیعری مەولەوی کە ئەو سەردەمە بە شیعری مەلا ڕەحیم ناوی دەرکردبوو.

هەر کە حەسەنی ئامێ دەست ئەکا بە وتن، مەولەوی لەسەر وڵاغەکەوە حاڵی لێ دێ و وەکوو بارانی بەهار ئاو بە چاویا دێتە خوارەوە. خەڵکەکە

ئەمەیان پێ ناخۆش ئەبێ، چونکە ئەوان بۆ شایی هاتوون، کەچی ئێستە شایی بوو بە شین و گریان. ئەچن بە حەسەن ئەڵێن: بابە ئیتر مەڵێ، با لەمە زیاتر گریانی مەولەوی شاییەکە نەکا بە شیوەن. حەسەن بێدەنگ ئەبێ و بەڵام پێشی ناخۆش ئەبێ کەوا گۆیندەیەکی وەکوو ئەو بۆ شتێکی وا بێدەنگ بکرێ. ئەچێتە بن دەستی مەولەوییەوە پێی ئەڵێ: «بەقوربانت بم! من شیعری تۆ ئەخوێنمەوە تۆ بۆچ وا ئەگری؟» مەولەویش ئەڵێ: «بەقوربانت بم! من کەی وا خۆشم وتوە؟»!.

١٧٤. کابرایەك تووڕە بوو لە کابرایەکی تر، وتی: «کورە کابرا دەستت بگرم، دەوری دنیات پێ بکەمەوە؟» کابراش وتی: «جا برا خۆ تۆ خۆیشت لەگەڵمای».

١٧٥. کابرایەك هەبوو شایی ئەکرا پێیان وت: «شایی و زەماوەندە». وتی: «بە من چی؟» وتیان: بۆ تۆیە. وتی: بە تۆچی؟.

١٧٦. وەستا محەمەدی خەیات هەبوو لە خانەقی خەڵکی سولەیمانی بوو، پیاوێکی قسەقوت و قسەنەستەق بوو. حەسەن بەگ هەبوو هەر لە خانەقی بە «حەسەن بەگلەر» بەناوبانگ بوو. لە عەشیرەتی «دەلۆ» بوو، لەبەر ئەوە خۆی بە سەرۆکی عەشیرەت ئەزانی تۆزێ بەسەر خەڵکیا هەبوو. کەوا و سەڵتەیەکی دابوو بە وەستا محەمەد بۆی بدوورێ، ئەویش هەر ئیمرۆ و سبەی پێ ئەکرد.

ڕۆژێك حەسەن بەگ بە تووڕەییەوە ئەچێتە سەری و بۆ ئەوە بیترسێنێ ئەڵێ: «وەستا تۆ نازانی من دەلۆم؟!». وەستاش هیچ لێی ناوەستێتەوە پێی ئەڵێ: «بەگم، تۆ نازانی من یانزە لۆم». حەسەن بەگلەر هیچی پێ ناوترێ.

١٧٧. جارێك قەشەیەك لەلایەن پاپاوە ئەچێتە سنە بۆ ئەوە گاورەكانی ئەوێ زیاتر فێری ئایینی گاوری بكا. ئەیەوێ كاغەزێك بنێرێتەوە بە پۆستە بۆ وڵاتی خۆیان، بەڵام ڕێگای «پۆستەخانە» نازانێ، زۆر ئەگەڕێ نایدۆزێتەوە.

تووشی كوڕێكی جوانكەلە ئەبێ پێی ئەڵێ: كوڕم تۆ ئەزانی پۆستەخانە لە كوێیە؟ ئەڵێ: بەڵێ. ئەڵێ: پیشانم بدە. كوڕە پێشی ئەكەوێ و ئەیبا پۆستەخانەی پیشان ئەدا. پاشان قەشە ئافەرینی ئەكا و پێی ئەڵێ: كوڕم تۆ چ دینێكت هەیە؟ ئەڵێ: قوربان من گاورم. ئەڵێ: ئای چەندم پێ خۆش بوو كە تۆ گاوریت. ئیمشەو وەرە بۆ كەنیسە بە تەواوی فێری ئامۆژگاری ئایینی گاوریت ئەكەم و ڕێگای بەهەشتت پێ نیشان ئەدەم. كوڕە وتی: «باوە بچوو وە ڕێگای خۆتەوە، تۆ ڕێگای پۆستەخانە نازانی ئێستە ڕێگای بەهەشت لەكوێ ئەزانی؟ بچوو بچوو».

١٧٨. «نووری حەبێ» هەبوو، جارێك لە وڵاتی هەڵەبجە بە شێخ محەمەد ئەڵێ: «یا شێخ هەچ پارەیەكی باوكت هەبوو هەموویت لە ڕێگای كێرتا دۆڕاند». شێخ محەمەدیش بەبێ وەستان دەستێك بە ڕیشی خۆیا دێنێت و ئەڵێ: «نووری، ئەمە من و ئەمە تۆ».

١٧٩. جارێك شێخ محەمەد لەگەڵ شێخ عوسمان لەماڵی شێخ خالددا ئەبن. شێخ خالد و شێخ عوسمان برا بوون، وە لەگەڵ شێخ محەمەدیشا ئامۆزا بوون. شێخ خالد تازە ژنی هێنابوو شتومەكی ناوماڵ لە دۆشەك و شتەی زۆر پەرداخ بوو. هەمووی هی ماڵی تازە زاوا و تازە بووك بوو.

شێخ محەمەد ئەچێ لەسەر دۆشەكە تازەكە دەست ئەكا بە خۆ

گەوزاندنەوە و ئەڵێ: بەخوا نەرم و خۆشە. شێخ عوسمان پێی ئەڵێ: شێخ محەمەد هەستە لەسەر دۆشەکەکە ڕامەکشێ نەوەک مەولانای برام بێتەوە و بە خێزانەکەیت تێبگا دەستێکت لێ بوەشێنێ. شێخ محەمەدیش بەبێ وەستان ئەڵێ: «شێخ عوسمان ئەی ئەگەر خێزانەکەی هاتەوە و بە شێخ مەولانام تێگەیشت چی ئەڵێی؟!».

۱۸۰. حەمەفەرەج هەبوو، زابتێکی موتەقاعید بوو. لەم دەورەی دواییەدا دەنگ وا بڵاو بووەوە کە لە مانگانەی موتەقاعیدەکان کەم ئەکرێتەوە.

ڕۆژێک لە سولەیمانی ئەم حەمە فەرەجە پیرێژنێکی تووش ئەبێ کە ئەویش مانگانەکەی تەقاویتی ئەبێ ئەڵێ: ئەرێ کاکە حەمەفەرەج! ڕاست ئەکەن ئەڵێن لە تەقاویتەکان ئەبڕن؟ ئەویش خێرا پێی ئەڵێ: «جا تازە خۆ تۆ کەڵکی تێبڕینت نەماوە».

۱۸۱. سەید ئەحمەدی خانەقا ڕۆژێک لەگەڵ شێخ حەسیبی تاڵەبانی ئەکەونە قسەکردن. سەید ئەحمەد ئەڵێ: «من کڵاوم لە سەرەوە دڕاوە». شێخ حەسیبیش ئەڵێ: «بەڵێ قوربان، ئەگەر کڵاوت بووبێ!».

۱۸۲. مەلا قادری کەرکووک مودیری وەقف ئەبێ، کابرایەکی زلەی جاف ئیشی وەقفی ئەبێ و ئەچێتە لای. ئەویش هەر دەری ئەکا، ئەمیش هەر واز ناهێنێ. لە ئاخرا مەلا قادر تووڕە ئەبێ و پێی ئەڵێ: کابرا بچۆ بەولاوە ئەڵێی ورچی، پیاو ئەترسێنی. ئەویش ئەڵێ: «قوربان من پەنجا ورچی وەکوو تۆم دیگە نەترسیاگم».

١٨٣. سەعید ئەفەنی ساڵح ئەفەنی ساڵی تەومینەکە لە تەومین بوو. کابرایەکی جاف ئەچێ بۆ شەکر و چا، کەرەکێك لە بەریا ئەبێ و بەر قاپییەکەی پێ ئەگرێ. بەم جۆرە گەلێ هاتوچۆ ئەکا. سەعید ئەفەنی پێی ئەڵێ: لاچۆ کابرا، ئەڵێی کورتانیت هەر لێرە کەوتووی!. کابراش ئەڵێ: «قوربان بێژم چی بۆ تۆ درووست کریاگم!».

١٨٤. کورێکی هەولێری بە کورێکی سولەیمانی وت: «ئەوە لۆچی بە رۆن ئەڵێن روون و بە روون ئەڵێن رۆن؟» کورە سولەیمانییەکەش وتی: «ئەی بۆچی ئێوە بە روون ئەڵێن رۆن و بە رۆن ئەڵێن روون؟» رۆن «روون»ـە؛ روون واتە خەست نییە.

١٨٥. کابرایەکی کورتەباڵا ئەچێتە لای «غوڵامشاخانی» والی شکات ئەکا ئەڵێ: پاشا کابرایەکی کورتەباڵا ستەمێکی زۆری لێ کردووم، حەقم بسێنە. ئەویش ئەڵێ: کورتەباڵا ستەمی لێ ناکرێ. کابراش ئەڵێ: «پاشا، ئەوەی زۆری لێ کردووم لە من کورتترە». والی دەست ئەکا بە پێکەنین و دادی ئەپرسێ.

١٨٦. مەولوو هەبوو خەڵکی سنە بوو. ژنێکی هەبوو رۆژی کوڵا بوو بەدەست ئەم ژنەیەوە. قسەی زۆری پێ ئەوت. رۆژێك ژنەکەی پێی ئەڵێ: «لاچۆ برۆ بێ‌فەرەی گون بۆگەنە! ئەویش ئەڵێ: «حەنیفەخانم چۆن بۆگەن نابێ ئەمە چل ساڵە دەرکەوانی دوابراوەکەتە». ئیتر ببڕای ببڕ حەنیفەخانم دوای ئەوە قسەی لە دەم دەرناچێ.

١٨٧. لە شەڕی پێشوودا بەهۆی شەڕەوە ئەرمەنەکان لەو سەرەوە سەرەوخوار بوونەوە، گەیشتبوونە مەراغە. کابرایەکی گەرووسیش

ڕۆژگار خستبوویە ئەوێ. ئەم کابرایە لەوێ غەریب و بێکەس بوو، خستبوویانە شوێنێ کە ئەمە لەو کەسانەیە کە دایکی خۆیان ئەگێن و سەرەتا مەجووس بوون. کابراش لەبەر بێکەسی نەیئەتوانی هیچ دەنگ بکا. ڕۆژێک یەکێ لەو ئەرمەنیانە بە سووکییەوە پێی ئەڵێ: «ئەرێ برا ئەوە ئێوە لە کەیەوە وازتان لە گاینی دایکی خۆتان هێناوە؟» ئەویش ئەڵێ: «وەڵڵا برا لەو ڕۆژەوە کە ئێوە ئەڵێن دایک ئەزێت و خوا دێنێت!».

١٨٨. شێخ ڕەزا جارێک تووشی ژنێک ئەبێ لە سولەیمانی زۆر بە لەنجە و نازەوە ئەڕوا. پێی ئەڵێ: «ئا بووکێ وەرە تۆزێ پێکەوە بنوین، بزانم تۆ خۆشتری یا ژنەکەی من؟» ژنەش بەبێ پشوو ئەڵێ: «یا شێخ ئەمەی پێ ناوێ ئەم پرسیارە لە مێردەکەم بکە ئەو لەگەڵ منیش نوستوە و لەگەڵ ژنەکەی تۆش نوستووە». شێخ ئەڵێ: «خوا بتانگرێ خەڵکی سولەیمانی».

١٨٩. شێخ ڕەزا لە کۆیە ئەبێ. جارێک ئافرەتێکی جوان بەناو کۆڵانێکا ئەڕوا، شێخ ڕەزا زۆر بە سۆز سەیری ئەکا. ئافرەتەکە ئەڵێ: «بۆچ سەیرم ئەکەی، تۆ کێرت هەڵئەستێ و یەکێکی تر ئەو ئیشە ئەکا».

١٩٠. سەی حەمەحەسەنێک هەبوو خەڵکی سنە بوو، ژنی زۆر زۆری ئەهێنا. جارێک ژنێکی هێنا و ژنە پاش ماوەیەک نەخۆش ئەکەوێ و بە سەی حەمەحەسەن ئەڵێ: «پیاوەکە ئەگەر من مردم تۆ چی ئەکەی؟» سەی حەمەحەسەنیش ئەڵێ: «ئافرەت ئەگەر تۆ نەمردی من چی بکەم؟».

١٩١. کابرایەکی کەچەڵ گاڵتەی بە کابرایەکی بەڵەک کرد. وتی: ها فلانی وا دیارە قەڵغانت هەڵگرتووە و ئەچی بۆ شەڕ؟ ئەی

تاسکڵاوت بۆچ لەسەر نەکردووە؟ ئەویش وتی: «ئەمەوێ تاسکڵاوەکە لە تۆ وەرگرم؟»).

١٩٢. کەریم ئەفەندی کەرکووکیزادە هەبوو جارێك ئەپرسێ لە شێخ نەجیبی قەرەداغ ئەڵێ: «یا شێخ خورما خواردن هیچ زیانی هەیە و حەرامە؟» ئەڵێ: نەء. ئەڵێ: ئەی ڕەشکە لەگەڵ نانا خواردن؟ ئەڵێ: ئەویش هەر وایە؛ هیچ زیانێکی نییە. ئەڵێ: ئاو خواردنەوە حەرامە؟ ئەڵێ: ئەویش هەر وایە، هیچ زیانێکی نییە. ئەڵێ: «شەرابی مستەکی لەمانە دروست ئەکرێ بۆچی ئەبێ حەرام بێ؟»).

شێخ نەجیبیش دەست ئەبا بە سەری دوو پەنجەی تۆزێ خۆڵ هەڵئەگرێ و ئەڵێ: ئەگەر ئێستە ئەم خۆڵە بکەم بە سەری تۆدا هیچ ئازارێکت ئەگاتێ؟ ئەڵێ: نەء. ئەڵێ: «ئەگەر تنۆکێ ئاو بکەن بەسەرتا ئەو تنۆکە ئاوە هیچ شوێنێکت ئەشکێنێ؟» ئەڵێ: نەء. ئەڵێ: «ئەگەر لە ئاو و لە خۆڵ خشتێك دروست کەن و لەبەر هەتاو وشکی کەنەوە و بیدەن بە سەرتا چیت لێ دێ؟» ئەڵێ: وەڵڵا ئەمکوژێ. ئەڵێ: «ئەمەش وەکوو ئەو وایە».

١٩٣. زەمانی زوو لە تەورێزەوە حاکم ئەنێررا بۆ سابڵاخ. جارێك حاکمێك نێررابوو لە تایفەی فەرمانفەرما بوو. زۆر دەمێك بوو لە سابڵاخ مابووەوە. کابرایەکیش هەبوو لە سابڵاخ «بلەباسکە»یان پێ ئەوت. ڕۆژێك بە حاکمە ئەڵێن: بلەباسکە کتومت لە جەنابت ئەچێ. ئەویش ئەنێرێ بە شوێن بلەباسکەدا و ئەیهێنن. پێی ئەڵێ: «ئەرێ بلەباسکە تۆ دایکت ئاوکێشی و هاتوچۆی ماڵە گەورانی کردووە؟» ئەویش ئەڵێ: «قوربان دایکم ئافرەتێکی زۆر بەشەرم و لەخوا ترس بوو، قەت

له ماڵ دەرنەئەچوو؛ بەڵام باوکم ئاوکێشی ئەکرد بۆ ماڵەگەوران و بە هۆی ئاو هێنانەوە ئەچووە حەرەمسەرای هەموو پیاوە گەورەیەك».

۱۹٤. زاوتێکی «آصف‌الدّیوان»ـی سنە هەبوو «ئاحەمالی» ناو بوو. بە ئیشی ئاسەف‌دیوان ڕێی ئەکەوێتە تاران، ماوەیەك ئەمێنێتەوە و مانگی موحەڕەمی بەسەرا دێت. لەو ماوەیەدا بۆ بێ‌تاقەتی لەگەڵ خانمێکا ڕێ کەوتبوو. شەوی دەی موحەڕەم ئەچێتەوە بۆ لای خانم، خانم وتی: «ئاغا ئیمشەو نابێ؛ چونکە گوناحی شەوی موحەڕەم بە دوو چەندان ئەنووسرێ». ئا حەمالیش وتی: جا خانم قەیدی چەس ئێمە وای دائەنێین کە شەوی یانزەی موحەڕەمە و دوو جارمان کردگە».

۱۹٥. کابرایەکی «سێوسێنان»ـی دێتە سولەیمانی و مێوانی کۆنە مودیرێکیان ئەبێ. کارەکەرەکە شەوێ جێگای لە حەوشە بۆ ڕائەخا. وا دیار بوو کابرا لەگەڵ کارەکەرا قسەیان کردبوو بە یەك کە لە پاش نیوەشەو بچێتە سەر بان.

لە دەمەوبەیانا مودیربەگ دەنگی پێکەنینی کابرای لەسەر بانی هاتە گوێ، هەستا چوو وتی: کورە کابرا چی ئەکەی لێرە؟ وتی: «قوربان بەدەم خەوەوە تلم خواردووە و کەوتوومەتە ئێرە». وتی: کورە کەرە ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ خەڵکی کە تل بخوا لە سەرەوە بۆ خوارەوە تل ئەخوا، تۆ چۆن لە خوارەوە بۆ سەرەوە تل ئەخۆی؟ وتی: «قوربان ئاخر پێکەنینەکەی منیش لەبەر ئەوەیە».

۱۹٦. لەو سەرەیە دەستەیەك ڕێ‌کەوتن بچن بۆ حەج. مامۆستا وەعزی بۆ ئەدان لە ناوەندی وەعزەکەدا وتی: ئەگەر ڕیزەبەردی حەرەمی کەعبە بکەوێتە ناو کەوشی یەکێکەوە، ئەو ڕیزەبەردە ئەوەندە

لەخوا ئەپاڕێتەوە و هاواری لا ئەکا تا ئەیخاتەوە شوێنی خۆی. یەکێك لە دانیشتووەکان وتی: وا دیارە ئەوەندە ئەپاڕێتەوە بەستەزمانە تا گەرووی دێتە یەك. مامۆستا وتی: ڕیزەبەرد گەرووی لەکوێ بوو تا بێتە یەك؟ (بۆیەش وای وت چونکە قسەکەی بە گاڵتە پێکردنەوە زانی). کابراش وتی: «کەواتە مامۆستا ئەگەر گەرووی نەبێ لە کوێ ئەپاڕێتەوە و هاوار ئەکا؟»!.

۱۹۷. مەلا سمایلی سولەیمانی دایکی مردبوو. ژنە مردووشۆرەکە هەموو جارێ پێی ئەوت: دایکی مەرحوومت بەهەشتی بوو، چونکە لەو کاتەدا کە ئەمشۆرد هەر پێ‌ئەکەنی. مەلا سمایلیش چەند جارێك ئەم قسەیە هەر قەبووڵ ئەکا و ئەبوا شتێکیشی بدابوایە. لە ئاخرا مەلا وەڕس بوو وتی: «قوڕ بەسەر عەقڵت، ئەوە ئەگەر پێکەنێن بێ، بەچی پێ‌کەنیوە؟ بە قوزی تۆ و خۆی پێ‌کەنیوە! ئەگینە ئەو وەختە وەختی پێکەنینە؟».

۱۹۸. کابرایەك لە مەلا مەحموودی حاجی عەلی پرسی: مامۆستا قازیقوڵنگ چۆن سەر ئەبڕێ و ئەکرێ بە بریانی؟ ئەویش وتی: «لە پێشا تۆ بیگرە جا ئەو وەختە پیشانت ئەدەم».

۱۹۹. مەلا کەریمی بیارە و شێخ فەتاحی «کوڵەجۆ»یی، تاهای حەمەجان و چەند کەسێکی‌تر لەلای من دانیشتبوون و هەموو جۆرە قسەیەك ئەکرا.

مەلا کەریم وتی: فڵانی ئەگەر تۆ نەمێنی ئەو وەختە ئەکەویتەوە بیری ئێمە. شێخ فەتاح وتی: «بەڵێ بۆ غەیری سك». (مەبەستی ئەوە بوو کە هیچمان لێ نەخواردووە لەو ڕووەوە ناکەویتەوە بیرمان).

٢٠٠. «خلك»ـی مستەفای پیرەوەیس هەبوو. جارێك گایەكی باری پـێ ئەبـێ، ئەچێتـە سولەیمانی ئەگاتـە بـەر مزگەوتـی مـەلا مەحمووی نیزامی. كاتی نوێژی عەسر ئەبێ، گایەكە لە دەرەوە بەجێ دێڵـێ و خۆی ئەچێتـە مزگەوتەكـە بۆ نوێژ. كـە دێتە دەرەوە سـەیر ئەكا ئـەوا منالێكـی حەلـوا فرۆش تەبەقـە حەلواكەی لەولاوە داناوە و سـواری گایەكـەی بـووە بـەو ناوەدا ئەیڕەتێنـێ. پێـی ئەڵێ: ڕۆڵە ئەوە بۆچ سـواری ئـەو گایـە بوویـت و وای لـێ ئەكـەی؟ ئەڵێ: وەڵڵا مامە لە ترسـی ئەوە نەوەك بڕوا و لە دەسـت بچێ. ئەڵێ: وەڵڵا ڕۆڵە ئەگەر بڕۆیشـتایە باشـتر بوو بەلامەوە كە تۆ وای ئەڕەتێنی. ئەڵێ: «مامە كەواتە وابزانە ڕۆیشتووە بیدە بە من، منیش شوكرت ئەكەم؛ شوكرەكەی منت بۆ ئەمێنێتەوە».

٢٠١. حسـێن قەرەداغی هەبوو لە نیوەی سەدەی بیستەمدا، كوڕی شێخ مستەفای قەرەداغی بوو، كە بە شێخ مستەفای موتەسەڕف بەناوبانـگ بـوو. ئـەم حسـێنە زەلامێكـی ئێجـگار قەڵـەو و ناكوڵۆكار و قسەقوتیش بوو.

جارێـك منالێكیـان ئەبـێ، باوكی لێی ئەپرسـێ: حسـێ چیت بووە؟ ئەڵێ: قوربان هیچم نەبووە زاهیدەی ژنم كوڕی بووە. ئەڵێ: چۆنە؟ ئەڵێ: «دەسـت ئەلێسـێتەوە، هێشـتا ماچی ناكا». ئەڵێ: هەتیو وا نالێم، ئەڵێم: جوانە یا ناشـیرینە؟ ئەڵێ: «قوربان ئەو لە من بێ و من لە تۆ بم ئەبێ چۆن بێ؟».

٢٠٢. حەمەی نادر هەبوو لە سولەیمانی جارێك شێخ ڕەزا ئەچێتە ئەوێ، كوتوپڕ لەناو بازاڕا تووشی حەمەی نادر ئەبێ كە سواری كەرێك بووە. چاوێكی لێ مۆڕ ئەكاتەوە و بە توانجەوە پێی ئەڵێ: «تەماشاكە

تەماشاکە سواری کەر بووە». حەمەی نادریش کوتوپڕ پێی ئەڵێ: «بەخوا شێخ لام وایە وا نییە؛ چونکە من قەت نەمدی ئەم کەرە سواری تۆ ببێ!».
ئیتر شێخ ڕەزا وسکت ئەبێ.

٢٠٣. کابرایەکی خەڵکی ئەم کوێستانە کە کورد بوو لە باوباپیریەوە لە «شاقەڵا» و «بس» و «مەولاناوا» جێگیر ببوو. جارێک کوردێکی گەرمیانی لە زستانا ئەبێ بە مێوانی. گەرمیانییەکە سەیر ئەکا وا لێژنەدار خرایە ناو ئاگردانەکە. ئەڵێ: بەخوا برا ئێوە لەزەت ئەوەن لەو دارە وشکەزەنگانە. کوێستانییەکە ئەڵێ: بۆچ ئێوە نیتانە؟ ئەڵێ: نەوەڵڵا. ئەڵێ: ئەی چی ئەسووتێنن؟ ئەڵێ: «برا شیاکە ئەکەین وە تەپاڵە و ئەیسووتێنین». ئەڵێ: «جا برا بەڵکوو گا ئەقڵی بڕی وساڵێ گووی نەکرد!».

٢٠٤. شێخ قادری سیامەنسوور ڕۆژێک لەگەڵ حەمیدئاغا قسە ئەکەن. حەمیدئاغا بە شێخ قادر ئەڵێ: «ماڵی ئێمە هەر لە نەدیتی دوعای خێر بۆ تۆ ئەکەن و چاکەت ئەڵێن». شێخ قادریش ئەڵێ: «لە نەدیتی بۆچی؟ دوور نییە چاویان پێم کەوتبێ!».

٢٠٥. سەردار لە بۆکان باخێکی نایابی هەبوو چوار دەورەی بە دیوار گیرا بوو. ڕۆژێک کابرایەک پەیژەیەک ئەبا ئەچێتە ناو باخەکەوە و دەست ئەکا بە مێوە دزین. لەو کاتەدا باخەوانەکە پەیدا ئەبێ. ئەمیش خێرا پەیژەکەی ئەخاتە سەر شانی و ئەڵێ: «هەی پەیژە!».
کابرای باخەوان ئەڵێ: کورە کابرا ئەوە چی ئەکەی لێرە؟ ئەویش ئەڵێ: پەیژە ئەفرۆشم. ئەڵێ: پەیژە لە باخی منا ئەفرۆشی؟ ئەڵێ: «برا پەیژەی خۆمە لە هەر کوێیەک ئەیفرۆشم ئەیفرۆشم!».

٢٠٦. [یەکێک] لە شاعیرە چاکەکان بوو، ڕۆژێك چووە مزگەوتێکەوە سەیری کرد وا کابرایەك لەگەڵ هەتیوێکا خەریکە. دەستی کرد بە قسە کردن، پێی وت: تۆ لە ماڵ خودا چۆن شتی وا ئەکەی؟ بە تەواوی کابرای تەریق کردەوە.

کابرا شاعیرەکەشی ئەناسی لە چ ماڵێکە؛ بۆی چووە کەمینەوە. ڕۆژێك بەگیری هێنا کەوا هەر لە هەمان شوێنا ئەویش خەریکی هەتیوێکە وتی: ها برا، خوا چاك هەق ئەخاتە دەست. ئەوەت لە چی و ئەمەت لە چی؟ ئەویش وتی: «برا نەتبیستووە ئەوی بۆ شاعیر دروستە بۆ غەیری شاعیر دروست نییە؟!». [یجوزُ للشّاعِرِ ما یَمْتَنِعُ].

٢٠٧. ئەحەی کڕنوو لەو شارەزوورە خۆی کردبوو بە حەکیم. پیرێژنێك چووە لای وتی: حەکیم گیان! من خواردنم بۆ هەزم ناکرێ و لەسەر دڵما ئەوەستێ؛ چارم چییە؟ ئەویش وتی: «ئەو خواردنە بخۆ کە بۆت هەزم ئەکرێ و لەسەر دڵتا ناوەستێ!».

٢٠٨. کابرایەکی تەوێڵەیی جووتێ کڵاشی نایابی لە پێدا بوو چووبووە سولەیمانی. لەوێ چووە مزگەوتێك، بە کڵاشەکانیەوە دەستی کرد بە نوێژ کردن. کابرایەك دڵی پیس کرد لە کڵاشەکانی و پێی وت: برا بە کڵاشەوە نوێژ نابێ. کابرای تەوێڵەیی تێ گەیشت کە مەسەلە لە چیدایە وتی: «برا ئەگەر نوێژ نەبێ خۆ کڵاش هەیە!».

٢٠٩. ژنێك سکی پڕ بوو، پاشان کچێکی هێنا. زۆری پێ ناخۆش بوو کە کوڕ نەبوو وتی: ئۆف بریا شتێك لەناو لنگیەوە بوایە ئیتر من دڵم سوکنایی ئەهات. مامانەکەی پێی وت: «کچم تۆ دوعای عومر درێژی بۆ بکە، ئەگەر بمێنێ ئەوەندە شت لەناو لنگیەوە ئەبینێ بێزار ئەبێ!».

٢١٠. کوڕێکی منداڵکار هەبوو لەو سەرە ئەحە زیرەکیان پێ ئەوت. ڕۆژێك لەگەڵ چەند کەسێکا چێشتێکی گەرمیان لە بەردەما بوو ئەیانخوارد، ئەحە دەمی سووتا و دەستی کرد بە هاوار هاوار. وتیان: ئەوە چییە؟ وتی: چێشتەکە گەرمە و دەمم سووتا. وتیان: دە لێگەڕێ تا سارد ئەبێتەوە. ئەویش پێی وتن: «ئاخر ئێوە لێی ناگەڕێن».

٢١١. پیاوێك هەبوو «حاجی دەروێش»ـی ناو بوو. لە کاتی خۆیا بوە بوو، ڕۆژگار پشتی تێ کرد. ڕۆژێك لە هەڵەبجە ئەچێتە بەر دەرگای ماڵێك داوای شتێك ئەکا بیدەنێ. کابرای خاوەن‌ماڵ دێتە دەرەوە و پێی ئەڵێ: برا ژنەکانمان لەماڵەوە نین. ئەویش ئەڵێ: کاکە برا من نەهاتووم خوازبێنی ژنتان لێ بکەم، وەیا زەماوەن بکەم، هاتووم داوای پارووێ نان ئەکەم، ئەمدەیتێ بمدەرێ، نامدەیتێ خوات لەگەڵ.

٢١٢. بەکراغای مەنگور هەبوو «چەتیو»ێك لەماڵیانا ئەبێ مارەی ئەکا و لەم چەتیوە کوڕێکی ئەبێ. ڕۆژێك لە کوڕەکە تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: بەچکە کارەکەر. کوڕەکەش پێی ئەڵێ: «بابە دایکم خانزادەتر بووە، بە ئاغە نەبێ ڕازی نەبووە».

٢١٣. مەحمووپاشای جاف و سەید فەتاحی جەباری بەینیان زۆر خۆش ئەبێ، هەر جارە کە مەحمووپاشا لە کوێستان ئەگەڕایەوە ئەبوو بە میوانی سەید فەتاح و بە قسەی خۆش و دەماخ‌بزوێن چەند ڕۆژێك لەگەڵیا ڕایئەبوارد.

ڕۆژێك لە قەراخ ئاوایی «بانگۆڵ» پێکەوە ئەبن، یەکێك لە قالۆچە ڕەشە دەشتەکییەکان هەندێ شیاکەی گولۆر کردۆتەوە و داویەتە بەر خۆی و پێوە ئەڕوا. مەحمووپاشا ئەڵێ: «سەید! گەرمیانی ئەوەتە

خەریکە کاروان ئەکا». سەید فەتاحیش ئەڵێ: «بەڵێ قوربان دیاری بۆ ماڵی پاشا ئەبا!».

٢١٤. شێخ مستەفای تەختە (تەختە گوندێکە لە ژاوەرۆ) جارێك کابرایەك ئەچێتە لای شکات لە کابرایەکی تر ئەکا کە چووە لەناو باخە گوێزەکەیا کۆڵێ گوێزی دزیوە. کابرای دزەی بە کۆڵێ گوێزەوە گرتووە و حەبیب ناوێکیش لە تەختە هەبوو ئەو حەبیبەش ئاگای لێیە کە ئەم کابرایە ئەم گوێزەی دزیوە؛ بەڵام نە کابرای خاوەن باخەگوێز وە نە حەبیب هیچیان ناوبانگێکی باشیان نەبوو، بەڵکوو زیاتر وا ناویان هەبوو کە درۆزنن. شێخ مستەفا ویستی شەرعیان بکات و لە ڕێگای شەرعەوە کابرای شاهید بە هیچ دەرکا.

لە حەبیبی پرسی: تۆ چاوت لێبوو ئەم کابرایە ئەو گوێزەی لەو باخە دزی؟ وتی: بەڵێ، من بەناو دارگوێزەکانا تێپەڕیم، ئەم کابرایە ئەم کۆڵە گوێزەی بە کۆڵەوە بوو لەناو دارگوێزەکانا هاتە دەرەوە. شێخ مستەفا وتی: تۆ کە بەناو دارگوێزەکانا تێپەڕیوی ئەو دارگوێزانە چەند دارگوێز بوون؟ حەبیبیش سەیری کرد شێخ مستەفا نیازی باش نییە لەگەڵیا و ئەیەوێ بەدرۆی بخاتەوە، وتی: «یا شێخ! تۆ ئەمە چل ساڵە لەم مزگەوتە تەدریس و شەرع ئەکەیت، ژووری ئەم مزگەوتە چەند دەستەکی تێدایە؟!» شێخ مستەفا وەستا و حوکمی کرد بەوە کە گوێزەکان بۆ کابرای خاوەن دارگوێز بێت.

٢١٥. «شەوکەت ئەفەندی» هەبوو لە سولەیمانی دەرسی ڕیازیاتی قوتابی ئەوت. ڕۆژێك باسی مەیموونێکی بۆ کردن کە کەوتۆتە بیرێکەوە، بیرەکە ئاوی تیایە، بە چنگەکڕێ ئەیەوێ بێتە سەر. بیرەکەش

قووڵ بوو، دە دەقیقەیەك بە ئەندازەی گەزێك سەر ئەكەوێ، بەڵام لەبەر خلیسكەی بیرەكە چارەكە گەزێك ئەچێتەوە دواوە.

شەرحی ئەمەی بۆ ئەكردن كە لە ئەنجاما بە بیست دەقیقە ئەم مەیموونە لە بیرەكە هاتە دەرەوە، ئایا ئەم بیرە ئەبێ چەندە قووڵ بووبێ؟

لە ساڵی دواییدا هەر چەشنی دەرسی مەیموون و بیرەكە بۆ قوتابیەكانی باس ئەكرد بەڵام ئەم جارە لە باتی ئەوە بڵێت بە بیست دەقیقە سەر ئەكەوێ وتی: بە بیست‌وپێنج دەقیقە سەر ئەكەوێ.

یەكێ لە قوتابیەكانی پار كە هەر لەو پۆلەدا مابووەوە وتی: مامۆستا خۆ جەنابت پار فەرمووت بە بیست دەقیقە ئەو مەیموونە سەر ئەكەوێ و لە بیرەكە دێتە دەرەوە، چۆن ئێستە ئەفەرمووی بە بیست‌وپێنج دەقیقە؟

شەوكەت ئەفەندیش بەبێ وەستان وتی: «كوڕم ئاخر مەیموونەكە ئیمساڵ پیر بووە».

٢١٦. مستەفا عومەری قائیمقامی «زاخۆ» بوو. ڕۆژێك لەگەڵ ڕەشیداغای بنەماڵەی شەمدینیدا ئەچێ بۆ گەڕانی ناوچەی زاخۆ. ئەم گەڕانەی پاش ئەوە ئەبێ كە نزیكەی هەشت مانگێك لە زاخۆ ئەمێنێتەوە. كە ئەچن تووشی گوندێك ئەبن ئەپرسێ ئەم گوندە هی كێیە؟ ڕەشیداغا ئەڵێ: هی «حازم‌بەگی شەمدیناغا»یە؛ تووشی گوندێكی‌تر ئەبن هەروەها. تووشی بەراو و ڕووبار و ناوچەیەك ئەبن دیسان ئەپرسێ و ئەویش هەر ئەڵێ: هی حازم بەگە. بە كورتی تووشی هەر شتێك ئەبن لەو وڵاتە ڕەشیداغا هەر ئەڵێ: هی حازم بەگە.

مستەفا عومەری لە وزەیا نامێنێ ئەڵێ: ئەمە زۆر سەیرە، دار و بەرد و ئاوی ئەم وڵاتی زاخۆیە هەمووی هەر هی حازم بەگە؟ ڕەشیداغا ئەڵێ: «مستەفا بەگ، بنەماڵەی حازماغا نزیكەی سەدوپەنجا ساڵە

لەم وڵاتەدا خاوەن مڵك و دەوڵەمەند بوون؛ ئەگەر لەمەش زیاتریان هەبێ هەر کەمە. بەڵام سەیرتر ئەوەیە کە جەنابتان هێشتاساڵی بەسەرا نەسووڕاوەتەوە کە بوون بە قائیمقامی زاخۆ، ئێستە بچۆ لە هەرچی گەسکدەر و دەرکەوان و ئاشپەز هەیە بپرسە هەموو هەر ئەڵێن: عومەرین».

٢١٧. ئەوا دلێری کوڕم تازە پێی ناوەتە حەو ساڵان و خستوومەتە قوتابخانە، مێملی قەڵەم و دەفتەرە. ڕۆژێك هاتەوە وتی: ئەرێ بابە ئەگەر قەڵەم و دەفتەرەکەم تەواو بوو، هی‌ترم ئەدەیتێ؟ وتم: ئا. وتی: «دە تەواو بووا!».

٢١٨. «امین‌السّادات» هەبوو لەم ئاخرەدا کەوتبووە بیارە. ڕۆژێك ئەچێتە دەرەوە لەو کەژە خەریکی پیشۆك خواردن ئەبێ. کابرایەکی جاف ـکە خزمەتکاری ماڵی مەحمووپاشا بووـ ئەچێ بەسەریا ئەڵێ: مامە سەیی ئەوە چی ئەکەی؟ ئەڵێ: برا، گیا ئەخۆم. ئەڵێ: جا مامە سەید بۆچ ناچی خزمەتکاری ماڵی پاشا بکەیت و گیا نەخۆی. ئەویش ئەڵێ: «خاڵە ئەی تۆ بۆ ناچی گیا بخۆیت و خزمەتکاری ماڵی پاشا نەکەیت؟».

٢١٩. لە دانشگای کوردی لە بەغدا لە پۆلی سێ، قوتابییەکان وا چووبووە دڵیانەوە کە من کەسیان ناناسم، وە منیش هەر وام پیشان ئەدان. ڕۆژێك کە ڕۆژی (١٩٧٠/٤/٢٨)یە، یەکەم سەعات دەرسی ئەوانم هەبوو، یەکێك لە قوتابییەکان کە ناوی عەبدوڕڕەحمان بوو وتی: مامۆستا تۆ لەناو ئێمەدا تەنها جەمیل هەمزە نەبێ کەسمان ناناسی. منیش گورج وتم: کامەتە جەمیل؟ ئەویش هەر خێرا پەنجەی درێژ کرد بۆ جەمیل و وتی: ئەوەتە.

.٢٢٠ ئەحمەدی عەزیزاغا یەکێك بووە لە نوکتەبێژ و قسەخۆشەکانی سولەیمانی. ڕۆژێك کچەکەی پێی ئەڵێ: «بابە نازانم تۆ بۆ وا بەینت لەگەڵ دایکما تێك چووە و ئەو گفتولفتەی جارانت لەگەڵی نەماوە؟» ئەویش ئەڵێ: «ڕۆڵە تا ئەو وەختە کە دایکت ژنی من و دایکی تۆ بوو، ئەوە بوو ڕێکوپێك بووین، بەڵام لەو وەختەوە کە بووە بە دایکی من و ژنی تۆ وا بەم جۆرە تێك چووین!».

.٢٢١ حاجی مەلا عومەری چۆمان «دووبز»ی گێڕایەوە وتی: ساڵی «کولە»کە بوو، ئەفەندییەك هاتبوو ژارەکولەی هێنا بوو، بەو دەشتی هەولێرەدا ئەگەڕا. وتی: هاتە گوندی «گردەسۆر» مامۆستا مەلا شەریفی بشر لەوێ مەلا بوو، وە یەکێك بوو لە مەلا چاکەکانی ئەو وڵاتە. ئەفەندی مامۆستای بەگیر هێنا پێی وت: مامۆستا چەند ئەستێرە بە ئاسمانەوە هەیە؟ ئەویش وتی: نازانم. ئەفەندی وتی: من ئەزانم: ئەم نازانمەی مامۆستا وای لە مامۆستا کرد بە جارێ هەموو شتێکی لێ تێك دا و ئەفەندی بە تەواوی خۆی قیت کردەوە و بەڕاستی لە سەرەوە بوو. هەموو جاریش دەستی بە سمێریا دەهێنا و ئەیوت: ئێوە هیچ نازانن و هەروا بەخۆڕایی هاتوونەتە ناوەوە.

لەو کاتەدا کرمانجێك هەبوو ناوی عەزیز بوو هات بەسەرا و سەیری کرد مامۆستا زۆر حاجزە بە دەست ئەفەندییەکەوە وتی: مامۆستا ئەوە لۆ وا حاجزی؟ وتی: وەڵڵا حەزیز ئەم ئەفەندییە شڕی کردیمە. وتی: لۆ؟ وتی: پرسیارێکی وای لێ کردیمە نایزانم و ئەویش دەرێ من دەیزانم. بەوە بە تەواوی سوارم بووە.

عەزیز وتی: مامۆستا ئەتەوێ من وەرامی بدەمەوە؟ وتی: جا حەزیز

لۆ کەیتە. عەزیز ڕووی کردە ئەفەندی وتی: ئەرێ ئەفەندی ئەو بەستۆڕەیە چەند بەردی تێدایە؟ ئەفەندی وتی: نازانم. عەزیز وتی: «ئەفەندی تۆ لە حەردی نەزانی لە ئاسمانان کوو دەزانی؟».

وتی: ئەفەندی وشك بوو ئیتر هیچ نەهاتە قسە. ئەو سەرەی کە دایخست بەرزی نەکردەوە هەستا لێی دا ڕۆیشت. ئەمجا عەزیز کەوتە جنێودان پێی.

٢٢٢. حەسەن بەگی جاف گێڕایەوە وتی: ساڵ ١٩٣٠ز تۆفیق وەهبی کرابوو بە موتەسەڕفی سولەیمانی. فەقێ محەمەدی هەمەوەن مودیری ناحیەی بازیان بوو، دەستەیەکی زۆر لە سولەیمانییەوە هاتبوون بە پیر موتەسرفەوە. یەکێك لەو کەسانە کە هاتبوون «عیززەت تۆپچی» بوو. ئێمە هەموو لای فەقێ محەمەد بووین، قائیمقامی چەمچەماڵ بە تەلەفۆن بە فەقێ محەمەدی وت: ئەوانەی هاتوون بە پیر موتەسرفەوە کێ و کێن؟ ئەویش ناوەکانی یەکەیەکە دایە، تا هاتە سەر عزت ئەفەندی. وتی: عیززەت. قائیمقام پرسی: کام عیززەت؟ عیززەت ئەفەندیش خۆی ڕاوەستا و بیرەیەکی ساردی بە دەستەوەیە ئەیخواتەوە وتی: «با بێژین عیززەتی خولەی فاتە درێژ». عیززەت ئەفەندی ئەمەی لە دڵا پێ خۆش نەبوو، بەڵام هیچ دەنگی نەکرد.

تەلەفۆن داخرایەوە و هەموو دانیشتووین چاوەڕێی هاتنی موتەسەڕف ئەکەین. فەقێ محەمەد ڕووی کردە عیززەت ئەفەندی وتی: «عزەت ئەوە چی ئەخۆیتەوە؟» عیززەت ئەفەندیش هیچ سێودووی لێ نەکرد بە دەنگێکی بەرز وتی: «فەقێ محەمەد ئەوە جۆیە، تۆ بە کاڵی ئەیخۆی من بە تەڕی!».

٢٢٣. پیاوێك هەبوو لە سنە (مەولوو) دراوسێکیان هەبوو «ئائەسکەر»ی ناو بوو. ئائەسکەر لەوانەبوو چەوری ئەدا لە سمێڵی و ئەیوت: چێشتەکەمان چەور بوو. بە دەمیشیەوە قورقێنە درۆزنەی لێ ئەدا. رۆژێك مەولوو سەبەتە «سێف زەوینی» ئەبردەوە بۆماڵەوە ئەبوایە بە بەردەرگای ماڵی ئا ئەسکەریشا بچوایەتەوە، نەیئەویست ئائەسکەر بەمە بزانێ، سەری سەبەتەکەی داپۆشیبوو، کە بەوێچدا تێپەڕی ئائەسکەر لە بەردەرگادا وەستابوو لێی پرسی: «ئامەولوو ئەوە چەس لەناو ئەو سەبەتەدا داتپۆشیگە؟» مەولوویش ئەڵێ: «ئائەسکەر ئەوە ئەو چتەس کە گەرەکمە ئێوە نەزانن چەس».

٢٢٤. مستەفا نەریمان گێڕایەوە وتی: حەیدەر لە هەولێر عەمری خوای کردبوو، من لە کەرکووك بووم. دەستەی مامۆستایانی سولەیمانی هاتن بۆ کەرکووك و پێکەوە لەگەڵ مامۆستاکانی کەرکووکدا چووین بۆ هەولێر بۆ پرسە. رۆژی سێیەمی پرسەکە بوو ئەمانویست زوو بگەین. بۆ لای ئێوارە چووینە هەولێر، جێگای پرسەکەمان نەئەزانی. چووینە بارەگای پارتی بۆ ئەوە ئەوان بمانبەن. کە چووین «ساڵح شێرە» لەوێ بوو، تۆزێ لۆمەی ئەومان کرد کە بۆچی تەلەفۆنێ شتێکی بۆ نەکردووین تا ئێمەش بمانزانیایە و زوو بهاتینایە؟ ئەویش وتی: «برا لۆمە لەسەر خۆتانە، بۆچی زوو تەلەفۆنێ شتێکتان نەکردووە بپرسن: کێ ماوە؟ کێ مردووە؟ تا منیش خەبەرم پێ بدانایە!»

٢٢٥. دیسان گێڕایەوە وتی: لە سەردەمی «سوورسووری»ـیەکەدا هەر ئەم ساڵح شێرەیە وەکوو گەلای دار جنێوی ئەدا بە سوورەکان و سەرباری ئەوەش سەرئەکەوت بۆ «لنین» و «ستالین».

سوورەکان چوونە لای پارتییەکان لە هەولێر وتیان ئێستە ساڵح شێرە جنێو بە ئێمە ئەدا ئەوا لێی ناگرین، بەڵام بۆ سەرئەکەوێ جنێو بە لنین و ستالینیش ئەدا؟ ئێمە ئەمەی لێ هەڵناگرین. لە بارەگای پارتییەوە ساڵح شێرەیان بانگ کرد بۆ موحاکمە و لێیان پرسی: کە تۆ شتی وات وتووە؟ ئەوا سوورەکانیش دانیشتوون. ئەویش لەباتی ئەوە بڵێ نەم وتووە وتی: بەڵێ وتوومە. وتیان: جا چۆن شتی وا ئەڵێیت؟ کارت چییە بەسەر ئەوانەوە؟ وتی: «برام ئەگەر یەکێ توورە ببێ لە یەکێ هەر هاروهاجی بکا پێی ئەڵێ: سەگی سەگباب. ئەگەر باوکە کەرانباوگاوەکەت باش بوایە ناجسنێکی وەکوو تۆی لێ نەئەکەوتەوە. منیش هەر وام وتووە خۆ هیچی‌ترم نەوتووە».

وەڵڵا هەموو دەست ئەکەن بە پێکەنین و وازی لێ دێنن.

٢٢٦. جارێك «هەجیجی»ـیەك ئەچێتە «نەوسوو»، جافرسان ئەیەوێ سەر بخاتە سەری. پێی ئەڵێ: «هەجیجی بۆ با شەڕە کێرێ کەرمێ»؛ (واتە وەرە با شەڕە کێر بکەین). هەجیجییەکەش لە وەڵامدا ئەڵێ: «قوربان هینەکەو من فەقیرەن، چیرەنە ملۆ»؛ (واتە هینەکەی من فەقیرە بە ژێردا ئەچێت).



# هەندێك لە داستانی ژن

٢٢٧. مەلا تۆفیقی حاجی برایم لە سولەیمانی چەند قسەیەکی گێڕایەوە وتی: کچێك هەبوو لەو خوارە-بلامانێ-تڕی بۆ ڕاگیر نەئەکرا، لەبەر ئەمە هەچکەس ئەهات بۆ خوازبێنی دایکەکەی نەیئەدا بە شوو. کچە بەم جۆرە هەر مایەوە نەیئەزانی خەمی بێدەنگی پێشی بخوا یا گیز و هۆڕی پاشی. ئاخری ڕۆژێك بە دایکی وت: دایە ئەگەر پڕ خێزان هاتن و داوایان کردم بمدە و کارت نەبێ. دایکیشی وتی: خوا بینێرێ کچم.

زۆری پێ‌نەچوو کوڕی کابرایەکی خێزان زۆر هات بۆ خوازبێنی. دایانێ و بووك گوێزرایەوە، لە پاش حەفتەیەك دایکی و چەند ئافرەتێکی‌تر ئەچن بۆ پاش تێلانە. دایکە بە ماتیییێکەوە ئەیەوێ لە پەنایەکا پرسیار لە کچەکەی بکا؛ کە هەلی بۆ هەڵئەکەوێ لێی ئەپرسێ: کچم لەگەڵ دوابراوەکە چۆنی؟ کچەش بەم جۆرە وەڵامی ئەداتەوە:

**دایە هەرگیز خەم مەخۆ مالم پڕ کردگە لە بۆ**
**خێزانی ماڵ هەشت و نۆ کەس ناپرسێ منم یا تۆ**

دایکە ناوچاوی کچەکەی ماچ ئەکا و ئەڵێ: بەخوا ڕۆڵە تۆ لە دایکت و لە نەنکیشت ئاقڵتر بوویت، بۆ ئەم مەسەلەیە ئێمە هەر لە هەوەڵ ڕۆژەوە پێیان‌زانین.

٢٢٨. کابرایەکی ژن مردووی دوو سێ منالّ بەسەرا کەوتوو ئەیویست ژنێکی‌تر بێنێ، بەڵام ژنێکی وا بتوانێ منالّەکانی بۆ بەخێو بکا.

هەرچەند ئەگەڕا دەستی نەئەکەوت. لە ئاخرا ناوبانگی ژنێکی تەڕپیری کەمەرە لە ملی دوو سێ دان لە پێشەوە کەوتووی بیست و چوو خوازبێنی کرد. خوا چارەنووسی لەیەك نووسین و دەستیان کردە گەردنی یەك.

شەوێ لە کاتی جووتبوونا ژنە بە مەکرێکەوە دوو سێ جار وتی: «ئای بڤە بڤە بڤە». پیاوەش کە ئەمەی بیست نەیکردە نامەردی دەستی کرد بە نقەنق و وتی: «عەمە عەمە». هەموو لێفە و دۆشەك و گەو و گیپاڵی ژنەی پیس کرد.

ژنەکە ئەمەی زانی، بڕیاری دا کە ئیتر واز لە فێڵبازی بێنێ، چونکە مێردەکەی گەلێ لەو زۆرزانتر بوو هەزار فاکێ بە فیکێکی.

٢٢٩. خێزانێك هەبوو لە بەختانیان بوو، بەشی زۆری ئافرەتیان بەبێ بن ئەچوونە لای مێرد. جارێك کچێکی ئەم بنەماڵەیە شوو ئەکا و زەماوەندی بۆ ئەکەن. شایەر و زوڕناژەن دێنن. شایەرەکە زۆر باش ڕەفتاری ئەم خێزانەی ئەزانی، لە کاتی هەڵپەڕکێدا بەم جۆرە گۆرانی ئەڵێ:

«دایکی وە بێ، خوشکی وە بێ، میمکی وە بێ، زوڕنا بژەن ئەمیش چە بێ؟»

٢٣٠. خێڵێك لە بناری «کانی‌کەوە» خستبوویان. گۆرانەکانی کانی‌کەوە هەموو جار بەشەو ئەچوون بۆ دزی و تاڵان کردنیان. کوڕێك لە خێڵەکە بوو «هۆمەری خاتوون»ـی ناو بوو، پیاوێکی ئازا و نەترس بوو. بە تاقی تەنیا بەرەنگاری لەشکرێکی ئەکرد. ئەوەندە هەبوو کە هەر جارە گۆرانەکان پەلاماریان ئەدان هۆمەر لە ماڵەوە نەئەبوو.

جارێك پەلاماریان ئەدەن و کوردەکانیش بەرهەڵستیان ئەکەن. لەوانە ئەبێ کوردەکان بشکێن و تاڵان بدەن بە دەستەوە، لەو کاتەدا قەرەنتووی

هۆمەر لە دوورەوە دەرئەکەوێ. کوڕگەل کە چاویان پێ ئەکەوێ ئەمە ئەڵێن:

«مانگەشــەوە تەقڵە دەوە        لەشــکر گەییە کانیکەوە
هۆمەر خاتە زوو سەرکەوە        نەوەك بشکێن ئا بەم شەوە

٢٣١. ژنێك کچێکی هەبوو دای بە شوو. لەو کاتەدا گواستیانەوە دەستی کردە پینگەپینگ بەسەریا و پاش ئەوە کە بردیان بەم بەیتانە ئەیلاواندەوە:

نۆ نانی خوارد وە نازەوە        نۆ نانی خوارد وە پیازەوە
نۆ نان لە ساجی گەرمەوە        نۆ نانی ڕەق وە بەرمەوە
نۆ نانی خوارد وە شیرەوە        نۆیشــی فڕان لە تیرەوە
دایکی مرێ گوڵوەشــان        وە دڵ ناشــتا بردشیان

٢٣٢. پیاوێکی کورد باسی ژنی بەم جۆرە کردووە:

ژن نیوەی ژنە، نیوەی ژانە        نیوەی مێمــڵ دۆڵەی نانە

٢٣٣. پیاوێکی کورد ئەیوت:

مەکــر ژنــان بار خــەران        خەر نەوەران چێش کەران

٢٣٤. لەو سەرە لە بن دەوارێکا هەندێك دانیشتبوون هەموو قسەیەکیان ئەکرد. سەرە هاتە سەر باسی ژن، هەرکە لە عاستی خۆی موچڕکێکی پیا هات. بەڵام کەسیان نەیانخستە خۆیان. یەکێ لە دانیشتووەکان وتی: برا ئەمەی پێ ناوێ ئێمە ئەگەر ڕاست ئەکەین با هەرکەسە ئەگەر لە ژنەکەی ئەترسێ قیت ڕاست ببێتەوە. هەموو بە جارێ هەستان تەنها یەکێك نەبێ. لێیان پرسی: وا دیارە تۆ هیچ ناترسیت لە ژنەکەت؟ وتی: «نەوەڵڵا حەدی چییە لێی بترسم، بەڵام ئیمڕۆ دارێکی

ماڵیوە بە قاچما کۆڵەواری کردووە، لەبەر ئەوە ناتوانم هەستم؛ ئەگینا وەنەبێ لەو بترسم».

٢٣٥. ژن کە مێرد ئەکا سەرەتا هەتا ماوەیەك هەرجار کە گەمەوگاڵتە لەگەڵ مێردەکەیا ئەکا بە نازێکەوە پاڵێکی پێوە ئەنێ و پێی ئەڵێ: «بچۆ بەولاوە کێر زل!». کە هەردوولایان پیر ئەبن، ژنەکە هیچ نایخاتە خۆی کە پیربووە، ئەمجا کە پاڵ بە مێردەکەیا ئەنێ پێی ئەڵێ: «بچۆ بەولاوە گوو زل».

٢٣٦. کابرایەکی ساویلکە لەو سەرە ژنێك ئەخوازێ. هێشتا سێ مانگی زاوا و بووکێنییان تێناپەڕێ خوا کوڕێکیان ئەداتێ. شەوێ لە گوێئاگردانەکەدا دانیشتوون و هەروا دەمەتەقێ ئەکەن، کابرا کە ژنەکە ئەگوێزێتەوە بە خەسووەوە ئەیگوێزێتەوە. خەسووەکەشی دانیشتووە ڕووی تێ ئەکا و پێی ئەڵێ: ماشەڵڵا ئەم کچەی تۆ بە بەرەیە، ئەگەر هەروا زوو زوو و هەر بە سێ مانگ جارێ کوڕێ بێنێ، زۆری پێ ناچێ منیش ئەوەندە کوڕ و کوڕزام ئەبێ تا ئەبم بە حەمەخانی بانە، هەموو ئەم ناوە دائەگرم.

خەسووەکەشی ئەڵێ: ئەیەڕۆ بەقوربانت بم! کەی بە سێ مانگ مناڵی بووە؟ نۆ مانگە و نۆ ڕۆژەی تەواو کردووە. ئەوە تۆ حسابی مانگەکانت لێ تێك چووە. بەم جۆرە ناوی مانگەکان ڕەوان کە ئەو وەختە بزانە سێ مانگ ئەگرێتەوە یا نۆ مانگ؟

**ئـازار، بەهـار، مانگـی دۆ　　نیسان سـەیران مانگی جۆ**
**ئەو مانگەی بووکیان تیا برد　　ئەو مانگەی کچە تیا شووی کرد**
**ئەو مانگـەی کوڕەی تیا بوو　　تەواو نۆ مانگ بەسـەر چوو**

کابرا ئەڵێ: ئەی بەقوربانت بم خەسوو گیان! بەخوا ڕاستە ئەڵێن خەسوویەك لە جووتێ گا باشترە، بەو قورحانە ئەگەر تۆ نەبوویتایە گوناحباریش ئەبووم و ئیمانیشم ئەڕۆیشت.

**٢٣٧.** پیاوێك لەو سەرە هەبوو بازرگانێکی زل بوو. ویستی بچێ بۆ «تەورێز» بۆ شتومەکی بازرگانی، کەسی نەبوو تەنها ژنێك نەبێ. شێخێکی بەدینی لەخواترس هەبوو لەو ناوە ناوبانگی دینداریەکەی ئەو وڵاتەی پڕ کردبوو. هەستا چووە لای و پێی وت: «قوربان من بۆ تەورێز ئەچم، دنیا هەزار مردن و ژیانی لە ڕێگەدایە. کیسەیەکی لە بەردەما دانا و پێی وت: ئەمە هەزار قڕانە ئەگەر تا شەش مانگیکە نەهاتمەوە بیدە بە ژنەکەم و پێی بڵێ: گەردنم ئازاد کا و ئەمەش حەق و حقووقەکەیەتی».
شێخ کیسەکەی لێ وەرگرت و وتی: ئیشەڵڵا بەبێ مزەڕەتی ئەگەڕێتەوە. کابرا لێی دا ڕۆیشت.

زۆری پێ نەچوو ژنە کەوتە تەنگانەوە و ناشزانێ ئەم پارەیە لای شێخ هەیە، وردە وردە دەستی کرد بە فرۆشتنی شتومەکی ناو ماڵ. هەر شتێك هەبوو نەبوو فرۆشتی و مێردەی هەر نەهاتەوە.

ڕۆژێك تاقە ئەموستیلەیەکی ئەڵماسی مابوو، دای بە کارەکەرەکەی و پێی وت: ڕۆڵە بچۆ ئەمەش بفرۆشە، چەند ڕۆژێکیش بەمەوە ڕائەبوێرین تا بەڵکوو خوا دەرگایەکمان لێ بکاتەوە. کارەکەر ئەنگوستیلەی هەڵگرت و چوو بۆ بازاڕ، کوتوپڕ لەناو بازاڕا بە بەر دووکانی زەڕنگەرەکانا تووشی بوو بە تووشی شێخەوە. شێخ، گەڕانی ئەم کارەکەرە بەم ئەنگوستیلەوە تۆزێ سەرنجی ڕاکێشا و لێی پرسی: تۆ کێیت؟ ئەویش وتی: من کەنیزەکی ژنی فڵانە تاجرم و ئاغەم ماوەیەکی زۆرە بە سەفەر ڕۆیشتووە، ئێستە

هیچمان نەماوە تەنها ئەم ئەنگوستیلەیە نەبێت. ئاغەژنم پێی وتم: بچۆ بیفرۆشە تا ئەمەش ئەخۆین خوا گەورەیە.

شێخ هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: کچم بچۆ بە ئاغەژنت بڵێ: کە ئاغات هەزار قرانی لەلای من بە ئەمانەت بۆ داناوە.

کچە لە خۆشییا لەوانە بوو پەڕ دەرکا، گەڕایەوە و قسەکەی بە ئاغەژنی وت. ئاغەژنیش لە خۆشی ئەم خەبەرە شوێنی بە خۆی نەئەگرت، کارەکەرەکەی ناردەوە بۆلای شێخ بۆ پارەکە. شێخ وتی: من ئەم پارەیە هەر ئەبێ بدەم بە دەستی خۆیەوە، چونکە ئاغە وای پێ وتووم و ناتوانم لێی لادەم. کارەکەرەکە لەوانەبوو بگەڕێتەوە، شێخ وتی: مەڕۆ، منیش لەگەڵت دێم با ئەو بە ڕووی سوورەوە نەیەت بۆ ئێرە. هەڵسا پارەی هەڵگرت و لەگەڵ کارەکەر ڕۆیشت.

کە چوونە ژوورەوە چاوی بە ژن کەوت، جەماڵ و جوانیی ژن هەموو شتێکی لە بیری شێخ بردەوە و کەوتە قسەکردنی غەرامی لەگەڵ ژنەدا. ژنە سەری شەرمی داخست و زۆر سەرسام ما؛ تیری عەشقیشی سات بە سات لە دڵی شێخا کاریگەرتر ئەبوو. شێخ زیاتر هۆشی لای خۆی نەئەما. ئەمجا پێی وت: یا شێخ تۆ ئەو پیاوە نیت کە ناوبانگی دینداری و خواناسیت ئەم ناوەی پڕ کردووە؟ ئێستە ئەمە چە کردەوەیەکە ئەینوێنی؟ شێخ وتی: «گیانەکەم، ڕووناکی ڕوومەتی گەشت، هەموو نوورێکی لێ شاردمەوە. ئەو سەردەمە کە عیبادەتم ئەکرد لە جەماڵی تۆ بێبەش بووم، ئێستە کە دەرگای ڕووناکی تۆم بۆ کرایەوە، ئیتر هیچ ڕووناکی و عیبادەتێکی ترم ناوێ. ئەم کاتە کە لەگەڵ تۆ دام، نوێژ و ڕۆژووی هەر چل ساڵەکەم دێنێ.

ژنە کە ئەمەی بیست وتی: هەستە بچۆرە دەرەوە هەی دەستبڕی

قیامەتفرۆش! ئەمە بوویت شێخە بەناوبانگە خواناسەکە؟ هەستە بچۆرە دەرەوە، بە شەرمەزارییەوە لام دامەنیشە و پارەی تۆیشم ناوێ. شێخ بە شەرمەزاری و بە دڵ پڕ لە کڵپەی عەشقەوە پارەی هەڵگرت و هەستا چووەوە.

ئەمجا ژنە کەوتە سەر ئەوە کە فێڵێك بدۆزیتەوە بۆ ئەوە ئەم پارەیە لەم خوانەناسە بسێنێتەوە. هیچی بە بیرا نەهات تەنها شکاتکردن نەبێ، هەستا چوو بۆ لای پادشا، لەسەر ئیعتباری ئێستە چووە لای ڕەئیسی تەشریفاتی. کە ڕەئیس چاوی پێکەوت ئاگری لە دڵیا کڵپەی سەند و دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵیا. لە پاش گەلێ قسەکردن ڕەئیس پێی وت: تۆ ناگەیت بە پادشا تا ئەوەی من ئارەزوو ئەکەم لەگەڵم نەکەی. ئەو وەختە پادشایشی ناوێ تۆ چۆن ئارەزوو ئەکەی وات بۆ ئەکەم. ژنە کە ئەمەی بیست بە بێدەنگی گەڕایەوە.

ڕۆژی دوایی هەستا چووە لای دارۆغە و شکاتی بەر ئەو خست. کە دارۆغە چاوی پێکەوت لەو کابرای پێشوو خراپتر پێی وت: بینایی چاوم چاو لە تۆ پۆشین ئیشی پیاوی ئاقڵ نییە. ئەگەر بێت و لە ئاوی ژیانت تاقە لێوانێك وەربگرم سەرم لە ڕێتایە و جارێکیکە پێویستت بەو جۆرە پارانەش نابێ. ژنە دیسان دەستی لەمیش گیر نەبوو، گەڕایەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی چوو بۆ لای قازی. قازی کە چاوی بە نیونگای ژنە کەوت [ئەوەی] لە قوتابخانەوە خوێندبووی تا ئەو وەختە هەمووی لە فیکر چووەوە! پێی وت: ڕووناکی دنیای دنیاداران چی تۆی هێناوەتە ئێرە؟ ژنە کارەساتی شێخی بەرماڵفرۆشی بۆ گێڕایەوە.

قازی وتی: «ئارام و هێزی شەیدایان! شەرع ئەفەرموێ: [بۆ] دەعوا ئەبم بە شاهیدت! ئەگەر لە سێبەری باڵای نەونەمامتا جارێك بە پاسەوان

وەرم‌بگری». ژنە کە ئەمەی گوێ لێ‌بوو سەرێکی بادا و دەستی لەویش بڕا و گەڕایەوە.

کە هاتەوە بە کارەکەرەکەی وت: بچێت لەلای دارتاشێك سندووقێکی گەورەی بۆ دروست کا و ئەم سندووقە سێ خانە بێ و هەر خانەیەك دەرگای خۆی پێوە بێ. کارەکەر چوو سندووقی دروست کرد و هێنایەوە.

ئەمجا پێی وت: بچێت بە ڕەئیسی تەشریفاتی بڵێت: کە سەرلەبەیان تەشریفی بێت بۆ ماڵی ئێمە. لەوێشەوە بچێت بە دارۆغە بڵێت: لە چێشتەنگاوا ئەویش بێت. کە لەوان بووەوە بچێت بۆ لای قازی پێی بڵێت: لە وەختی نیوەڕۆدا ئەویش خانم بانگێشتنی بۆ کردووە. لە پاش ئەوان بچێت بۆ لای شێخ کە پاش نێوەڕۆ بێت بۆ ماڵیان، خانم لەسەر ئارەزووی ئەو ئەبزوێتەوە. کارەکەر چوو هەموو ڕاسپێرییەکانی بە ئەنجام گەیاند.

ئەو شەوە ڕۆژ بووەوە؛ کە کەوتە بەیان تەقە لە قاپی درا و کارەکەر چوو بۆ دەرگا سەیری کرد ڕەئیسی تەشریفاتییە. خانم چوو بە پێشوازیەوە و هێنایە ژوورەوە. لە پاش دانیشتن و هەندێ قسە کردن، دەنگی تەقەی قاپی حەوشە هات. کارەکەر چوو و هاتەوە وتی: دارۆغەی شارە هاتووە. ڕەئیسی تەشریفاتی ڕەنگی لە ڕوو بڕا و وتی: بۆ خاتری خوا چم لێ ئەکەی؟ خانم وتی: وەڵڵا بەم دەمودەستە هیچ شوێنێك نییە تەنها ئەو سندووقە نەبێ، سێ خانەی هەیە ئەچیتە هەر کامێکیانەوە بچۆ. ڕەئیس چووە ناو یەکێ لە خانەکانا و خانم هەر خێرا هەستا دەرگاکەی لەسەر داخست.

تا ئەم ئەمانەی کرد دارۆغە هاتە ژوورەوە و دانیشت و کەوتە باسی غەرامیات و عەشقێنی. خانمیش کەوتە پشی‌پشی لەگەڵیا، کوتوپڕ دەنگی تەقەی قاپی هات. کارەکەر چوو بەشوێن دەنگەوە هاتەوە وتی: قازی

تەشریفی هێناوە. دارۆغە ناوکی کەوت و وتی: خانم چیم لێ ئەکەی؟ قازی پێم بزانێ ناکرێ. ژنە وتی: ئەوا ئەو سندووقە هەیە دوو خانەی تیایە بچۆرە یەکێکیانەوە تا قازی ئەڕوا. دارۆغە هەستا و خۆی کوتایە یەکێ لە چاوگی سندووقەکانەوە. خانم هەستا و دەرگای لەسەر داخست.

لەو کاتەدا قازی بە گۆنای سوور و دڵی بەجۆشی ئاگری دڵدارییەوە کردی بە ژوورا و خانم بە عیشوە و نیوعیشوەوە چوو بە پیریەوە و داینا.

قازی خۆی لە دنیایەکی ترا چاوپێ کەوت. خۆی لە شوێنێکا چاوپێ کەوت کە دڵڕفێنەکەی شەرابی ئاڵی لە لێوی خۆی ئاڵتر ئەدا بە دەستیەوە. قازی لە دەریای دوو جار سەرخۆشیدا مەلەوانی ئەکرد، کوتوپڕ دەنگی تەقەی قاپی هات. کارەکەر چوو بەشوێن دەنگەکەوە و هاتەوە وتی: شێخی پیری پیرانە و لەم شوێنەدا میوانە. قازی کە ناوی شێخی بیست ڕوومەتی سووری بوو بە بەی زەرد. وتی: ئەگەر شێخ لێرەدا بمبینێ حەیا و ئابڕووم ئەچێ و تا ماوم خۆم ناگرمەوە، چیم لێ ئەکەی؟ خانم وتی: وەڵڵا هیچ شوێنێك نییە ئەو سندووقە نەبێ خانێکی تێدایە بچۆرە ناویەوە. قازی هەر خێرا ڕاپەڕی و خۆی کوتایە چاوکی سندووقەکەوە و خانم دەرگای لەسەر داخست.

شێخ کردی بە ژوورا. خانم پێشوازی کرد و دەستێکی خستە سەر شانی و بە زەردەخەنەیەکەوە پێی وت: یاخوا بەخێر بی شێخی بەرماڵ فرۆش! چۆن وا ڕێت لێ تێك چوو گەیشتیتە لای ئێمە؟ شێخ وەکوو دەنگی فریشتەی ئاسمان بەرگوێی بکەوێ خوتووکەیەك بە هەموو لەشیا هات وتی: «ڕایەڵی عەشقی تۆ هەزار وەکوو من ڕائەکێشێ».

ژنە وتی: لەلایەنی پارەکەوە چی ئەڵێی؟ ئەگەر بمدەیتەوە چی ئەڵێیت بەگوێت ئەکەم. شێخ وتی: «چۆن ناتدەمەوە؟ خوایە تۆ ئاگات لێ بێ

مێردی ئەم ژنە هەزار قرانی لای من داناوە کە بیدەم بەم ژنە. ئەگەر ئێستە لە دنیای کامەرانیا تۆزێ بە نازی خۆی بمحەسێنێتەوە و لە کامی خۆیم بداتێ، هەزار قرانەکەی ئەدەمەوە. ئیتر چیت ئەوێ خانمی هەردوو دنیام؟»!

ژنە کە ئەمەی بیست بانگی کارەکەرەکەی کرد و پێی وت: وەرە ئەم دین‌فرۆشە بکەرە دەرەوە و خۆی لێی دا چوو بۆ لای پادشا. پادشا داوای ڕەئیسی تەشریفاتی کرد، دیار نەبوو، وتی: قازی بانگ کەن، قازیش نەبوو. پادشا لەم ڕێکەوتە سەری سوڕ ما، ناچار ژنەکەی بانگ کردە لای خۆی و لێی پرسی. ژنەش کارەساتی بۆ گێڕایەوە کە هەزار قرانی لایەتی و نایداتەوە. پادشا وتی: تۆ بۆ ئەم داوایەت شاهیدت هەیە؟ ژنە وتی: «بەڵێ سندووقێکم لایە، ئەو سندووقە شاهێدمە». پادشا دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: تۆ شێت بوویت؟ ژنە وتی: پادشاهم شێت نەبووم و شێت نیم، سندووقێکم هەیە ئەو سندووقە شاهێدمە. پادشا وتی: ڕەنگبێ جوانییەکەت سەری لێ تێك دابێتی. ژنە وتی: پادشاهم با واش بێ، من هەر لەسەر قسەی خۆمم، بنێرە بیهێنن.

پادشا پیاوی نارد و سندووقێکی گەورەیان هێنا و دایاننا. ژنە هەستا و چووە سەر سندووقەکە و دەستێکی پیا ماڵی وتی: سندووقەکە بەو خوایەی کە دروستی کردووین ئەگەر ئەوی کە بیستووتە نەیڵێیت، ئێستە ئاگرت تێ بەرئەدەم. کوتوپڕ سێ زمان لەناو سندووقەکە هاتنە قسە و وتیان: «ئەشهەدوبیللا ئێمە شاهیدین کە ئەو شێخە وتی: هەزار قرانی ئەم ژنەم لایە». لەلای پادشا دەرگای هەر سێ خانەی سندووقەکەی کردەوە وەکوو زەردەواڵە ڕەئیسی تەشریفاتی و داروغە و قازی هەریەکە لە کونێکەوە هاتنە دەرەوە.

پادشا لەم ئیشە و لەم کردەوەیە زۆر سەرسام ما، ئەوانەی هەریەکە بە تۆڵەی خۆی گەیاند و پارەشی لە شێخی بەرماڵ‌فرۆش بۆ ژنەکە وەرگرتەوە.

ئەوەندە هەبوو قازی ڕووی کردە ژنەکە و وتی: «هەرکە لە ئێوە نەترسێ لە خواش ناترسێ».

**٢٣٨.** هەژاری شاعیر هۆنیویەتیەوە:

کوڕ بــە دایکی وت: بێجگــە لە باوە
چەند شووی ترت بوون؟ وەرامی داوە
نۆمێــرد لەو هۆزی نۆیــان لەم هۆزی
دوو نــۆش لە هۆزی نــەورۆزە قۆزی
نــۆ هەر لەبــەر تاو خۆیــان دەدۆزی
نۆشیان نیوەی ساڵ دەژیان بێ ڕۆزی
شەشە و شەشــان و شەشێکی‌تریش
ورچــەی ئامــان و ڕەشــێکی‌تریش
بەخوا ڕۆڵە گیان دەســت بە هەویرم
وردە مێــردەکان کــەم دێنــەو بیــرم

**٢٣٩.** ئەڵێن لە یەکێ لە کۆشکەکانی «تەیمووری لەنگ»ـدا گەلێ پەیکەری تێدا هەبوو، بەتایبەتی سێ پەیکەری تێدا بوو کە لە هەموو پەیکەرەکان زیاتر سەرنجی خەڵکیان ڕائەکێشا. یەکێکیان زەلامێکە سەری داخستووە و خەریکی فیکر کردنەوەیە، یەکێکی‌تریان ئەوا بە هەردوو دەست بەر بووەتە سەر و پۆتەلاکی خۆی و بەسەر خۆیا ئەماڵێ. وردە وردە جارجار موویەکی ڕیشیش هەڵئەکەنێ. ئەوەی سێهەمیش دەستەسڕێکی گرتۆتە دەست و سەما ئەکا.

لە ژوور سەر هەریەك لەمانەوە نووسراوێك نووسراوە. ئەوی یەکەم لە ژوور سەریەوە نووسراوە: «ژن بێنم یا نەیەنم». لەسەر سەرووی دووەمین نووسراوە: «کە ئەمە ژنی هێناوە و پەشیمان بووەتەوە». لەسەر سێیەمینەوە نووسراوە: «کە ئەم پیاوە ژنی هێناوە و تەڵاقی داوە و ڕزگاری بووە». وە نامەیەکیشیان داوەتە دەست، ئەمەی تیا نووسراوە:

ئەوی ژن دێنێ و ژنی لەماڵە    خۆشی نابینێ هەرگیز لەو ماڵە
ئەوی ژنــدارە و تەڵاقی داوە    موژدە بێ کەوا خوا بەوی داوە

٢٤٠. لەو کوێستانی سەر سنووری تورکیایە لە گوندی «باڤۆ» پیاوێکی زۆر زۆر لە خواترسی بەنەخوێن پاك هەبوو بەناوی «پیران»ـەوە ناوی دەرکردبوو. ژنێکی هەبوو «خەجێ»ـی ناو بوو. ئەم پیرانە لەو ڕۆژەوە بلۆقی بووبوو تەرکی دنیای کردبوو، لە ئەشکەوتێکی دوور لە گوندەکەوە خەریکی خواناسی و نوێـژ و ڕۆژوو و زیکر و فیکر بوو؛ بە هیچ جۆر توخنی ئاوەدانی نەئەکەوت. بە تەواوی دوور لە بێگانە و نزیك لە یەگانە بوو. خەجێ جارجار نانێکی بۆ ئەبرد و بەو نانە قنیاتی ئەکرد. نزیکبوونەوەی لە خوا بە تەواوی تێری کردبوو لە دنیا، بەم جۆرە چلساڵی ڕەبەق خەریکی عیبادەت و خواناسی بوو. تەمەنی جوانی ئەو و خەجێی ژنی لە بەهاری گەنجیدا کەوتە خەزانی پیری. دان کەل و چاو کز و گوێی هەردووکیان گران بوو، بەڵام «پیران» لە مەعنەوییاتی پیران بەشێکی وەرگرت و بە تەواوی جێگای خۆی بەهۆی دوور بوونەوەی لە دنیا لە کۆڕی خواناسانا تەخت کرد.

شەوێك لە نیوەشەوا لەو وەختەدا کە ماڵ بێ ئەغیارە و دۆست خەبەردارە، لەو وەختەدا کە دڵی خواناسان پەردەی تاریکی لەسەر هەڵئەگیرێ، بەو ڕووناکییەوە ڕوو ئەکاتە نووری خوا، دەنگێك لە پشت

پەردەی نهێنییەوە هاتە گوێی: ئەی پیران! لەبەر ئەوە کە تۆ ئەمە چل ساڵە لە زیکر و فیکری خوادایت و بە تەواوی پشتت لە دنیا کردووە و ڕووت لە خوا، لە پاداشی ئەم عیبادەتی چل ساڵییەتدا خوا سێ نیازت لێ قەبووڵ ئەکا؛ جا خۆت سەرپشك بە، سێ شت داوا بکە، خوا بە هاناتەوە دێت و هەرسێ شتەکەت بۆ بەدی دێنێ.

پیران لە بیستنی ئەم دەنگە تاسێك بردیەوە و هەروا سەری سوڕ ما و هەروا کەوتە دەریای خەیاڵەوە وتی: ئەمە ئەبێ دەنگی شەیتان بێ و بیەوێ لە خشتەم بەرێ!. بەم جۆرە مایەوە تا کەوتە شەوی دوایی. دیسان لە هەمان کاتا هەمان دەنگ بە چەشنی قسە هاتەوە قسەکردن و ئەوی دوێنێ شەوی پێ وتەوە. پیران ئەوەندەی‌تر کەوتە سەرسامییەوە و پەژارە بە تەواوی دایگرت؛ نەیئەزانی چۆن لەم گێژاوە خۆی دەرباز کا، هەروا ئەتلایەوە تا کەوتەوە شەوی سێیەم و کاتەکەی شەوان. دیسان دەنگەکەی هاتەوە بەر گوێ و وتی: پیران هەر ئەم شەوەت ماوە، ئەوەی داوای ئەکەی بیکە داوای ناکەی بەسەر ئەچێ. کە ڕۆژ بووەوە خەجێی خێزانی لەسەر ڕەوشی جاران هەندێ نوێردە نانی بۆ هێنا و هاتەوە بۆ لای؛ سەیری کرد پیرانی مێردی بە تەواوی ڕەنگی هەڵبزرکاوە و هیچ ڕەنگ لە ڕوویا نەماوە. پرسی: پیاوەکە بۆچ وات لێ‌هاتووە؟ پیاوە هیچ دەنگ ناکا. زۆر سەری خستە سەری لە ئەنجاما وتی: خەجێ واز بێنە شەیتان ئەیەوێ لە خشتەم بەرێ. وتی: ئەیەڕۆ چۆن؟ تۆ پیاوی خوای شەیتان بە تۆ ناوێرێ. پیران دەستی کرد بە گریان و بە هەناسە هەڵکێشان سۆزی دەروونی ئەگەیشتە گەردوونی ئاسمان. خەجێ وتی: پیاوەکە دەنگ بکە سوێم بووەوە. پیران وتی: ئافرەت دەنگی چی بکەم؟ ئەمە سێ شەوە نیدایەکم بەرگوێ ئەکەوێ ئەڵێ: تۆ چل ساڵە گۆشەگیریت

کردووە بە پیشە و خواناسی ئەکەیت، ئێستە خوا لە تۆڵەی پارێزگاری ئەم چل ساڵەدا سێ نیازت بۆ بەجێ دێنێ، داوای بکە. ئەمە جگە لەوە کە دەنگی شەیتانی بێ و بیەوێ لەخشتەم بەرێ، هیچی‌تر نییە.

خەجێ وتی: ئەیەڕۆ پیاوەکە بۆ وا ئەڵێی؟ تۆ پیاوێکی دیندار و خواناس بوویت، ئەمە چل ساڵە خۆتت دوور گرتووە لە هەموو نافەرمانییەك. خوا ئەگەر تۆڵەی یەکێکی وەکوو تۆ نەداتەوە تۆڵەی کێ ئەداتەوە؟

خەجێ بەم قسانە وردە وردە پیرانی سارد کردەوە و هێنایە سەر ئەوە کە ئەو دەنگە نهێنییە دەنگێکی ڕاستەقینەی خواییە و دوورە لە شەیتان و هیچ لە خشتەبردن نییە. ئەمجا پیران وتی: باشە ئافرەت داوای چی بکەم؟ داوای ئیمان و عاقیبەت خێری بکەم؟ داوای ئەولادی چاك و ساڵح بکەم؟ داوای ماڵ و سامان و پایەی دنیایی بکەم؟ داوای چی بکەم؟

خەجێ وتی: پیاوەکە یەکەم نیاز و داوات ئەوە بێ کە خوا من گەنج بکاتەوە و بمباتەوە تافی جوانی و ڕەنگ و ڕوخسار و جەماڵێکی وام بداتێ لە دنیادا وێنەم نەبێ. ئەو وەختە من ئەم چەند ساڵە چەندەم خزمەت کردووی، بەگوڕ ئەبمەوە ئەوەندەی‌تر و زیاتر لەوەش خزمەتت ئەکەم. ئاسایشی دین و دنیات بۆ پێك دێنم و لە خێزانی ئەیووبی پێغەمبەر چاکتر خزمەتت ئەکەم و زیاتر بە هاناتەوە دێم.

پیران وتی: ئافرەت من و تۆ تازە تەمەنمان ڕابواردووە، خۆشی و ناخۆشی دنیا هەر شتێك بووبێت بەسەرمان بردووە. من کە دوعا ئەکەم با دوعای ئەوە بکەم خوا ئەولادی چاك و ساڵحمان بداتێ. هەم بە کەڵکی ئەوەمان دێ لە دنیا تا ماوین بە هانامانەوە دێن و بە دەردمان ئەخۆن، کە مردیشین یەکێك ئەبن لەو شتانە کە پێغەمبەر ﷺ لە بارەیانا وتوویە: خێر و سەدەقەیەکی ڕەوانن، قەت لە دوایی هاتن نایەن.

خەجێ وتی: پیاوەکە کە من گەنج بوومەوە ئەو ئەولادەی کە تۆ ئەڵێیت: ئەبێ بە خێر و سەدەقەیەکی جاری؛ ئەوەش ئەبێت و منیش گەنج ئەبمەوە و تۆیش ئەکەویتە ڕەحەتی، بە یەك دوعا سێ شتی زۆر بەکەڵکمان بۆ دێتە دی.

خەجێ بەم جۆرە قسانە و بەم جۆرە ئامۆژگارییانە بردیە دڵی پیرانەوە کە قسەکەی زۆر باشە و بە یەك داوا کردن سێ شتی زۆر گەورەیان بۆ پێك دێت، بەڵام هێشتا هەر بە تەواوی دڵی نەیئەهێنا. وتی: ئافرەت ئەم سێ دوعایە کە من ئەیکەم یەکێکی بۆ عاقیبەت خێری و ئیمانداریمان بێت؛ یەکێکی بۆ ئەولادی چاك و ساڵح بێت؛ یەکێکیشی بۆ ماڵ و سامان بێت. ئەو وەختە هەم دینیشمان ئەبێت هەم دنیاش.

خەجێ وتی: پیاوەکە ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ سێ نیازەکە بۆ لە شتێکا ئەخەیتە کار کە ئەو سێ شتە بە یەك دوعا جێبەجێ ببێ؟ کە من گەنج بوومەوە ئەو وەختە بە سانایی ئەتوانم خزمەتی مناڵەکان بکەم، ئەو مناڵانەی کە لە من و لە تۆ بن ساڵح و چاك ئەبن. کە گەورەش بوون ئیش و کار ئەکەن لە بەرهەمی ئیش و کارەکەی ئەوانا دەوڵەمەند و خاوەن سامانیش ئەبین. بەهۆی چاکە و سەلاحەتەکەشیانەوە سەدەقەی جاریشمان بۆ دروست ئەبێ. فەرمایشی پێغەمبەرﷺ دێتە دی، عاقیبەتمان خێر و ئیمانداریش ئەبین. پیران قسەکانی خەجێ بە تەواوی کاری تێکرد و بڕیاری دا کە یەکەم دوعای جوان بوونەوەی خەجێ و بە ئاوات گەیشتنی خەجێ بێ.

شەوی دوایی لە نیوەشەودا چووە سەر بەرماڵ دەستی بەرز کردەوە و داوای ئەوەی کرد لە خوا کە خەجێی خێزانی بچێتەوە تەمەنی گەنجی و جوانییەکی باشی بداتێ.

نزای پیری پیران لە گۆشەی ڕەشماڵانا جێگیر بوو. بەیانی کە هەستان سەیری کرد خەجێ ئەو خەجێیە نەماوە: ناسك و نازدارێکە نە بخۆیت و نە بکەی هەر تەماشای گەردنی بکەی، دوو چاوی ڕەشکاڵ، دوو گۆنای پڕی ئاڵ، سەر پڕ لە قژی ئاوەڵدامەنی کاڵ، لە سنگ و بەرۆکا لە بەژن و سەرۆکا وێنەیەکی بێ وێنەی ئەم ژێر ئاسمانی شینە بوو. نە زولێخای میسری و نە شیرینی ئەرمەن، نە چاو بەخوماری کوردستان و نە پەلك سەوزی داستان، هیچیان نەیئەگەیشتنێ. زمان هەر ئەوەندە ئەتوانێ بڵێ: وێنەیەك بوو لە نەخشی کردگار، تازە بە تازە کەوتە ناو ڕۆژگارەوە.

لەولاوە خەجێ کە تەماشای خۆی کرد خۆی بەڵەندامێك هاتە بەرچاو لە بازاڕی شۆخییدا، نە فریشتەی ئاسمان نە پەری کێوی قاف کەسیان ناوێرن شان بدەن لە شانی.

گوڵی نەونەمامی بەهاران، پەلکە زێڕینەی ئێواران، نموونەیەکن لە کاڵای باڵای وەکوو چەتری تاوس. خۆی بڵاو کردەوە، دڵی بووژایەوە، ڕووی گەشایەوە، خەرامان خەرامان بەسەر نازا نازی ئەکرد. گوڵ لە ڕوومەتیا، شەوبۆ لە بۆیا سەری شەرمەزاری و ڕووی ژاکاویان دانەواند؛ خوا بیدا ئاوای ئەدا.

بەم جۆرە خەجێ کەوتە ناو لالەزاری جوانی و شۆخی، وردە وردە ناوبانگی نازك و نازداری خۆی بیستەوە، بە جۆرێك بیستیەوە کە خەرامانی چینی لە چاو ئەما کەنیزەکی زەنگییە. ڕۆژبەڕۆژ زیاتر ئەبوو بە نیشانگای پەنجەی سەوداسەران. هەر ئەوەندە بوو خەجێیش وەکوو تاوسی لێ هاتبوو، چۆن تاوس سەیری چەتری کلکی خۆی ئەکا فیز ئەیگرێ و ئەگەشێتەوە، کە سەیری قاچی ئەکا فسی ئەنیشێتەوە؛ ئەمیش کە سەیری جوانی و بیستنەوەی ناوبانگی خۆی ئەکرد ئەوەندەی‌تر گەشکە

ئەیگرت، بەڵام کە سەیری «پیران»ـی دان‌کەلی چاوکزی سەرلەرزۆکی ڕیش‌کلووی بەفری مێردی ئەکرد، سەری ئەبردەوە بە قوڵاخی خۆیا.

لە ئەنجاما وردە وردە پێی لە پیرانی مێردی بڕی و کەمتر ئەهات بە لایا. ئەو خزمەتەی کە جاران هەیبوو بۆی، لە باتی ئەوەی لێی زیاد بکا، هەر کەمی ئەکردەوە. ئەو ماڵ و منداڵانەی کە جاران بە تەنگیانەوە بوو، ئێستە چکەچکە بەرەڵای کردن و خستنیە پشت گوێ. ماڵ بێ‌خاوەن و بێ‌ناز مانەوە، پیرانی بەناو مێردی هەرچەند قسەی لەگەڵ ئەکرد، بە لالووتەوە جوابێکی ئەدایەوە. خەجێ ئەوی بە دڵیا نەهاتایەوە ماڵ و منداڵ و پیرانی مێردی بوو. سەرمەستی دنیای ئاهەنگ و جوانی بوو، لەباتی کوڕە لاوێك هەزاری وەکوو ئەمیرئەڕسەلانی ڕۆمی و جوامێری هەمەوەن و شەمسامئاغای تەرگەوەڕی لە بەردەرگایا ئەکەوتن. کاڵای ناوازەی شاران بە ناوی دیارییەوە بە بار هەروەکوو باران ئەباری بە سەریا.

خەجێ کە جاران بە خواردنی نانی هەرزن و لەبەر کردنی کراسی جاوی هەجیجی ڕایئەبوارد، ئێستە شەکری ئەخوارد و بە شیر دەستی ئەشۆرد. ئاوریشمی لەبەر ئەکرد و پێڵاوی زەرکفتی لە پێی ئەکرد. نە یادی پیران لە دڵا ما، نە نازی منداڵان. پیران بێ ژن و منداڵ بێ دایك و ماڵ بێ کەیبانوو مانەوە. هەرچەندە پیران ئەیوت: ئافرەت تۆ چیت وت و ئەمە چییە؟ خەجێ وەکوو گوێزی بۆ بژمێرن وا بوو، کاتێکی ئاهەنگی خۆی بە هیچ نەئەگۆڕییەوە.

پیران کەوتە ئامۆژگاری‌کردنی و پێی وت: ئافرەت ڕۆژانی ڕابوردووت لەبیر بێ، ئافرەت ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە. بۆ منت بەرەڵا کرد و مناڵت سەرگەردان کرد؟ بترسە لە سۆزی ئاهی دەروێشان، دنیا لەسەر یەك لا ناسووڕێتەوە، بیر لەو خوایە بکەرەوە کە تۆ لەچ ڕۆژگارێکا بوویت و بە

یەك هەناسە كەوتیتە چ ڕۆژێك. هەر ئەو خوایە ئەو دەسەڵاتەی هەیە بتباتەوە دۆخەكەی جاران. واز بێنە و لە كەلی شەیتان وەرە خوارەوە.

خەجێ وتی: ئەی پیری بێ‌فەڕی لاتی پەككەوتووی لە برسا مردوو! عەمری خۆت و منالّت نەمێنێ، تۆ چیت و خۆتت بە چی داناوە! بەو سەر و سەكوتەوە ئامۆژگاری من ئەكەی؟ من ئێستە هەزارێك لە بەردەرگاكەما كەوتوون. سەگەكانیان وەكوو تۆ وانە. تۆ چ ڕاییێكت هەیە خۆت بە منەوە ببەستی؟ چاوت بكەرەوە من كێم و تۆ كێیت. تۆ ئەسپێ تێی‌داویت، ئەتەوێ خۆت بەسەر منەوە پاك كەیتەوە. من تۆ هەر ناناسم و هیچ ڕۆژێك لە ڕۆژان هیچ پەیوەندییەكت لەگەڵ منا نەبووە. ئەم فلتەفلّتە لە چی؟ تۆ كەی لەو پیاوانە بوویت نازك و نازدارێكی وەكوو من چلّمت پیا بسوێ، وەیا بە پەڕۆی پیس هەڵت بگرێ. ئەم نابەجاییەی ئێستە كردت، جارێكی كە نەیكەیتەوە! ئەگینا ئەڵێم بەو كەسانە كە لە بەردەرگاكەما كەوتوون زندەبەچاڵت كەن. تۆ ڕایەی ئەوەت ناكەوێ من منالّم لە تۆ بووبێت؛ منالّی چی و شتی چی؟ من گوڵێكم لە باخی جوانیی ئەم دنیایەدا، بڕۆ، بڕۆ چیت لە دەست دێ درێغی مەكە. ئەمەی وت و لەناو شەپۆلی دەریای گەورەییدا لێی دا ڕۆیشت.

ئەم قسانە زۆر كاری كردە دڵی پیران، بەڵام كە بیری ڕۆژانی پێشوو و بیری لانەوازی منالّەكانی ئەكردەوە، هۆنەهۆن فرمێسك ئەهات بە چاویا و هەر ئەیوت: لێبووردن باشە، ئەیناردەوە بۆلای خەجێ. خەجێ لە جارانی پێشوو خراپتر جوابی ئەدایەوە، كە منالّەكانی ئەنارد بۆ لای، ئەیوت: بەڵكوو بەزەیی پیایانا بێتەوە؛ ئەو منالّی دەرئەكرد و ئەیوت: ئێوە هیچ منالّی من نین. بە كورتی خەجێ لە ناو ئاهەنگی خۆشگوزەرانی و ڕابواردنی شاهانەدا مەست بووبوو؛ نە پیرانی بە دڵا ئەهات، نە منالّی

خۆی و پیران.

پیران ئیتر گەیشتە جەرگی، شەوێك بۆی لەسەر بەرماڵ دانیشت و دەستی بەرز کردەوە وتی: خوایە نیازێکی‌ترم کە پێت هەیە ئەوەیە خەجێی ژنم بکەیت بە دێڵەسەگێکی ڕەشی چوارچاو. تیری دوعای پیران لە ئاسمانەوە تێ‌پەڕی و گیرا بوو. خەجێ پێستی سەگی چوارچاوی کرا بە بەرا و بوو بە دێڵەسەگێك ئەجوولێتەوە و ئەشکێتەوە. سەیر ئەکا لە پێستێکی‌ترایە، هاوار ئەکا لە نووزە و قۆڕەیەك بەولاوە هیچی‌تری لە دەم نایەتە دەرەوە. هۆشی هەیە، بەڵام زمانی نییە؛ گیان هەیە، بەڵام لە پێستێکی‌ترایە؛ سەیری خۆی ئەکا ئایا ئەمە خەجێی خەرامانی چینە یا دێڵەسەگێکی چوارچاوی ماچینە؟ ئەمەی ئێستە خەوە و ئەیبینێ یا ئەوەی پێشووی خەو بووە و ڕۆیشتووە؟ ئەتلێتەوە و ئەپلێتەوە؛ ئەیەوێ قسە بکا، قسە نییە. هەرکەس دێ بە لایەوە لەباتی چاوبەخوماری کوردستان، سەگێکی گەرمیان ئەبینێ. ئەڵێ: چاوبەخومار فریشتەیەك بوو باڵی گرتەوە، ئێستە لە شوێن ئەوا سەگێك جێی‌گرتۆتەوە.

بەرەبەرە دەوری ماڵەگەورە چۆڵ بوو، ئاغا و جووتیار کەوتنەوە گەڕانەوە، هەرکە بۆ دیار. کەنیزەکانی کارەکەر ڕەویان کرد و کەوتنە گەڕ، لەباتی هێنانی سینی شیر و شەکەر، بوو بە فڕێدانی لەتکەنان و لوولاقی کەر. لەباتی باوەشێنی نازداران، بوو بە لووتەشەقی ڕێبواران، لەباتی دەنگی های و هووی سەرخۆشانی عەودالی «دۆ»ی بەشان دەسڕۆك، بوو بە دەنگی ئادەی چەغە لەو کسۆك. ئەو بارەگا ئاوەدانە بوو بە کاولە و وێرانە. خەجێ نووزەیەکی لە زەوی و یەکێکی لە ئاسمانە، هەرکە بەلایا ئەڕوا ئەم سەیری ئەو ئەکا و ئەو سەیری ئەم ئەکا، ئەم بە چاوی بە بەزەییەوە ئەنووزێنێ، ئەو بەچاوی خەشمەوە ئەبۆڵێنێ.

دەنگوباسی سەردەمی ئەم و پیران لەناو خەڵکا هەبوو، یەکێ ئەیوت: ئەمە خوای پیرانە، یەکێ ئەیوت: ئەمە دێڵەسەگی گوێئاگردانە. ئەوەی لێرە بوو فریشتە بوو، ئێستە لە ئاسمانە، هەتا یەکی گرت قسەی ئەم هەمووانە، گشت وتیان: ئەمە ئاه و نزوولەی شێخی پیرانە. ئەی خەجێی بەدبەختی ئاخرشەڕ، هیچ چارت نییە ئەوە نەبێ پەنا بەریتە بەر ئەشکەوتەکەی پیران.

خەجێ ئەمانەی هەموو گوێ لێیە، بەڵام ناتوانێ قسە بکا. لە نووزە بەولاوە زمانی ناگەڕێ بە شتێکی‌تر. هەرچەندە سەیریش ئەکا کەسێك نییە بە دادیا بگا و تیماری دەردی کاریگەری بکا.

لە ئەنجاما هیچ چاری نەما بە تلاوتل و بە کلکەلەقێ خۆی گەیاندە ئەشکەوتەکەی پیران. پیران دەرکی ئەشکەوتی لێ پشکۆڵ کرد. خەجێی دێڵەسەگ بە دەوری ئەشکەوتا ئەگەوزی و ئەینووزاند و ئەیقۆڕاند. مناڵەکانی لێ کۆبوونەوە. مناڵ سەیری ئەویان ئەکرد ئەگریان، ئەو سەیری مناڵی ئەکرد ئەیناڵاند و ئەیقۆڕاند. مناڵ ئەچوونە لای پیرانی باوکیان، باوکیان لە دەریای خەم و پەژارەدا نقوم بووبوو، ئەهاتنەوە لای دایکیان لە سەگێکی ڕەشی چوارچاوی تەپاوتل‌کەر زیاتر، هیچیان بەرچاو نەئەکەوت، ئەیاندایە پرمەی گریان. لە گریانی ئەوان و دایکیان و پەژارەی باوکیان، ئەرز و ئاسمان بەزەیی ئەهاتەوە پێیانا.

مناڵەکان چوون، ئەمجارە کەوتن بەسەر باوکیانا و بە گریان و زاری ئەمان و لەولاوە بە دەنگی نووزە و پاڕانەوەی خەجێ، ئەمیش دەستی کرد بە گریان بەسەر مناڵەکانیا. ماوەیەك بەم جۆرە تێپەڕی، بڵێسەی ئاگری دەروون ڕۆژبەڕۆژ تیژتر ئەبوو. ئاگری جگەر پیرانی هەڵگرت. شەوێك لە نیوەشەوا بۆی چووەوە سەر بەرماڵ و دەستی بەرز کردەوە

وتی: خوایە نیازێکم ماوە گیرای بکەی، ئەویش ئەوەیە لەبەر خاتری منداڵەکانم خەجێی ژنم بەریتەوە دۆخەکەی جارانی و ببێتەوە بە خەجێکەی جاران. تیری دوعای گیرا بوو، خەجێ پێستی سەگی لە کۆڵ بووەوە و بووەوە بە خەجێکەی جاران و چووەوە ئەو دۆخە کە لەگەڵ پیرانا بە کزییەوە دائەنیشتن. ئەوەندە هەبوو پیران نوێژ و ڕۆژووی چل ساڵ و هەرسێ دوعاکەی، بە تڕەکەی خەجێدا دەرچووا!

٢٤١. حەمەی نادر هەبوو لەو شارەزوورە. برایەکی هەبوو؛ ئەم برایە ژنێکی هەبوو ڕۆژی کوڵابوو بە دەستیەوە؛ هەموو جار گلەیی لەلای حەمە ئەکرد کە ژنەکەی لەگەڵیا باش نییە. حەمەش پێی ئەوت: برام تۆ خۆت پیاو نیت، ئەگینا ژن چییە پیاو بەدەستیەوە بکەوێتە زەلالەتەوە؛ دەسا ژنەکەی من هەرکە چاوی لێ بەرز ئەکەمەوە لەوانەیە زەنەقی بچێت. ئەویش وتی: جا برا تۆ چیت لەگەڵ کردووە وا بەو جۆرە هاتۆتە ژێر ڕکێفت. [حەمە وتی:] هەرکە جووڵاوەتەوە بە تاکە کەوش سەروگوێلاکیم ناوەتە یەك. جارێك و دوو جار وام لەگەڵ کردووە ئێستە ئیتر وەکوو ماستی مەیوەی لێ‌هاتووە. وتی: سا برا وەڵڵا منیش وای لەگەڵ ئەکەم. یاخوا کارت ڕاس بێ برا وا ئەم ڕێگەیەت پیشان دام! ئیتر بێگومان ڕزگارم ئەبێ.

کابرا بە دڵێکی خۆشەوە چووەوە بۆماڵەوە. هەرکە چووە ژوورەوە بەبێ چرپە تایێ لە کەوشەکانی داکەند بۆ ئەوە بیماڵێ بەسەر ژنەکەیا و ئاقڵی بکا. ژنەکەی چاوی پێ کەوت لیێی شیتان و وتی: کورە ئەوە شێت بووی وا ئەو تاکە کەوشەت داکەند؟ کابرا وتی: «نەوەڵڵا خانم گیان! ئەوە بۆ ئەوەم داکەند بیماڵم بە سەر خۆما!».

٢٤٢. کابرایەك هەبوو زۆر لە ژن ئەترسا، لە لایەوە وابوو ژنی بێگوێبەن نییە. پاشان ناو و نیشانەی ژنێکی بەحەیا و حسمەتیان بۆ هەڵدا و لەگەڵ ئەمەشا زۆر دەست ڕەنگینە. چوو ئەو ژنەی هێنا و نەوکلی دایە سەر خۆ. شەوێ لە ژنەکەی پرسی: ئایا تۆ هیچ دەست ڕەنگینی و پیشەیەکی دەستیت هەیە؟ وتی: نەوەڵڵا من پیشە و سەنعەتم لە قاچمایە. وتی: دەك موبارەك نەبێ.



# تاڤگەی ئێلاخ

٢٤٣. لە قسەی کوردییە ئەڵێ: جارێك ڕێوییەك لەو بنارەدا تێ ئەپەڕێ، ئێسترێکی تۆڕ تێری خواردبوو، ڕاکێشا بوو بە تەواوی نوستبوو، هیچ جووڵەی نەئەکرد. ڕێوییەکە بە پشتیا تێپەڕی گوڵمەی قنگی دەرپەڕیبوو. ڕێوییەش لای وابوو ئێسترەکە تۆپیوە، تەماعی کردە قنگەسوورە دەرپەڕیوەکەی. چەمۆڵەیەیکی بۆ درێژ کرد. هەر چەمۆڵەی گەیشتە قنگی ئێستر، ئێسترم ئێستر بوو، ڕاچەنی و ڕاپەڕی و ڕاست بووەوە. چەمۆڵەی ڕێوی لەناو قنگیا گیری خوارد و خۆیشی بە پاشووی ئێسترەوە داڵەڕۆچکە بوو. ئێستر کەوتە جامبازە بەو دەشتەدا. لە ڕێگەیدا چەقەڵێك چاوی پێیان کەوت وتی: «ها خێرە مام ڕێوی وا خۆتت بە پاشکۆی ئەو ئێسترەدا هەڵواسیوە؟ ڕەنگبێ بەخێر بۆ حەج بچن».

ڕێوی وتی: «بەخوا ئاغە چیت عەرز بکەم، ژیان و مردنم بەستراوە بە ترێکی ئەم ئاغەمەوە. بەخێر ئەگەر ئەم ترێکی کەند ئەو وەختە فیکرێکیش لە حەجەکە ئەکەینەوە».

٢٤٤. تینووم بوو لەگەڵ مام پیرداود دانیشتبووین. لەبەر ئەوە ڕیشی سپی بوو، حەزم نەکرد ڕاستەوڕاست بڵێم: ئاوم بۆ بێنە؟ وتم: بەخوا مام پیرداود ڕەنگبێ ئاوەکە سارد بێ. وتی: ئا. وتم: پیاو ئارەزووی ئاو خواردنەوە ئەکا. وتی: ئا. وتم: ئەگەر پیاو تینووی بێ بڕوا ناکەم ئەگەر ئاو بخواتەوە سەرمای ببێ. وتی: هم. وتم: جا ئەگەر پیاو تینووی

بوو چی ئەکا؟ وتی: ئاو ئەخواتەوە. ئێستە و ئەوسا ئاوی هەر بۆ نەهێنام.
منیش وتم: ئەگەر بەم جۆرە بەدەمیەوە بڕۆیـن تا ئێوارە لـێ نابینەوە و
وازم لێ هێنا.

٢٤٥. کابرایەك هەبوو کوڕێك و ئاشێکی هەبوو. بە کوڕەکەی وت:
ڕۆڵە ئەگەر ئەزانی شتیترمان زۆرە، ئاشەکە بفرۆشە و ژنێکی
پێ بێنە بۆ خۆت.

کوڕەش چوو ئاشـەکەی فرۆشـت و بە پارەکەی ژنێکی هێنا. لە پاش
ماوەیـەك لات کەوتـن، هیچیـان نەما. وتی: تەماشـاکە ئـەوی ئارد ئەڕێ،
فرۆشم بۆ ئەوەی گوو ئەڕێت.

٢٤٦. مەلا یەحیای چرۆستانی بۆی گێڕامەوە وتی: ئەحەی کڕنوو چوو
بوو بۆ حەج و گەڕابووەوە و گەیشتبووە «تسن»ـی کەرکووك.
کەشیدەیەکی حاجیانی لەسەر بەستبوو. لەوکاتەدا لە تسن مردوویەکیان
لێ مردبوو، بردبوویان بۆ سەر قەبران. پەکیان کەوتبوو بۆ مەلایەك تەڵقینی
بخوێنـێ، کـە حاجـی ئەحمـەد بەوێدا تێئەپەڕێ. بە مـەلای ئەزانن و
بەرۆکی ئەگرن بۆ ئەوە تەڵقینی مردووەکەیان بۆ بخوێنێ. ئەویش هیچ
خۆی تێك نادا و ئەچێتە سەر گۆڕەکە و بەم جۆرە تەڵقینەکە ئەخوێنێ،
ئەڵێ: «کەرکووکی ئیبن کەرکووکی خواردنت «سلّق» و «یارکۆك»ـی کە
نەکیرت دێنە سەر، گوێ تەپ نەکەی وەکوو کەر، هەستە بڵێ: تلی تلی
دەستم لە دەستی شاقولی، کفنم ئەخەمە سەر ملی ئەچمە جەحەنم تا
بنی، تەڵقینەکەت لەبەر... بۆتییەخوێنم "اللهاکبر"».

وتم: مەلا، ئەمە ئەگەر شیعرە زۆر لەنگە. وتی: «ئەحەی کڕنوو بە شیعری
ئازادی ئاورووپی ئێستە وتوویە، خۆی نەبەستۆتەوە بە وەزن و قافیەوە».

٢٤٧. ساڵێك والییەك ئەچێتە «توزخورماتوو» لەو ئیشانە کە ئەیکا یەکێکیان ئەوە ئەبێ کە خەڵکەکەی ئەوێ فێری نوێژ کردن بکا. جاڕ ئەدا هەرکە نوێژ بکا هەموو ڕۆژێ «مەتالیك»ـێکی ئەداتێ. تەقە ئەکەوێتە دوزەوە، کەس نامێنێتەوە کە نوێژ نەکا.

هەتا چل ڕۆژ بەم جۆرە لەگەڵیان ئەڕوا و پاشان پارەکەیان لێ ئەبڕێ. سەیر ئەکا کەس نەچووەوە بۆ نوێژ و هەموو لێی پەشیمان بوونەوە. پێی وتن: ئەوە بۆ نوێژەکەتان دایە دواوە؟ پێیان وت: «ئێمە هەر بەقەدەر پارەکە نوێژ ئەکەین؛ پارە بدە تا نوێژ بکەین».

٢٤٨. کابرایەکی شارەزووری بە میوانی ڕێی ئەکەوێتە سولەیمانی و شەوێ ئەچێتە ماڵی دۆستێکی. شەوێ، چا و ئاوێکی ساردی زۆری لێ ئەخواتەوە. لە کاتی نوستنا لە ژوورێکا ئەینوێنن و دەرکەی لەسەر دائەخەن؛ کەسی تریش لە ژوورەکەدا نابێ، تەنها مناڵێکی چوار پێنج ساڵانی خانەخوێکە نەبێ.

شەوێ کابرا میز زۆری بۆ دێنێ. هەڵئەستێ بچێتە دەرەوە سەیر ئەکا دەرگا لە پشتەوە داخراوە. ئەگەڕێتەوە، زۆر پەرێشان ئەبێ خۆی ڕاناگرێ، فیکر ئەکاتەوە بچێت مناڵەکە لابا و میزەکەی بکاتە ناو جێگاکەی ئەوەوە، کە بەیانی هاتن ئەڵێن: ئەمە مناڵەکە خۆی میزی کردووە و کابراش ڕزگاری ئەبێ. لە ڕاستیدا فیکرێکی باش بوو. کابرا ئەچێ مناڵەکە هەڵئەگرێ ئەیخاتە جێگاکەی خۆی و پڕ ناو جێگای مناڵەکە ئەکا لە میز و ڕزگاری ئەبێ. ئەمجا دێتەوە مناڵەکە هەڵئەگرێ ئەیباتەوە بۆ ناو جێگاکەی خۆی و ئەمیش دێت لە شوێن خۆی ڕائەکشێ.

کە ڕائەکشێ سەیر ئەکا لاڕانی ئەکەوێ لە شتێکی شل و بۆنێکی

پیسیش دێت!. تومەس ئەمە مناڵی زیرەك لەو وەختەدا كە كابرا هەڵیئەگرێ و ئەیهێنێتە ناو جێگاكەی خۆی، بە عادەتی شەوانی، لای وا ئەبێ ئەوە دایكی هەڵیساندووە بردوویە بۆ سەر ئاودەست! ناو جێگای كابرا پڕ ئەكا لە پیسایی.

سەیرتر ئەوە بوو تا بەیانی میزی كابرا لەناو جێگای منالّەكەدا وشك بووەوە.

٢٤٩. جوولەكەیەك هەبوو لە سابڵاخ «شەلەمۆ»ی ناو بوو؛ كچێكی هەبوو دابووی بە شوو. لەلای جوولەكە، كە كچ درا بە شوو ئەبێ پارەیەكی باش بخرێتە تەكی. شەلەمۆ دووسەد تمەنی خستبووە تەك كچەكەی. شەوێ كابرای زاوا نەئەچووە پەردە ئەیوت: دووسەد تمەن چییە خستوویانەتە تەكی؟ بە ناچاری بە شەلەمۆیان وت. شەلەمۆ بە تووڕەییەوە هات بۆ ماڵی زاوا و پێی وت: «هەی سەگی سەگباب! من كچێكی چواردە ساڵەم بە دووسەد تمەنەوە پێ داوی و ئەڵێم بیگێ؛ كەچی تۆ نایگێیت. وەرە تۆ سەد تمەن بە من بدە هەتا من خۆت و هەچ خزم و عەشرەتێكت هەیە هەمووتان بگێم!».

٢٥٠. كابرایەك وا چووبووە دڵیەوە كە بووە بە گەنم و مریشك ئەیخوا. لەبەر ئەمە كون بە كون خۆی لە مریشك ئەشاردەوە. لە دواییدا چار نەما گرتیان و خستیانە شێتخانە. ماوەیەكی پێ چوو وتیان: چاك بووەتەوە و هێنایانە دەرەوە. هەركە چۆوە ماڵەوە مریشكێكی بەرچاو كەوت، دایە بانگەڵا و هاوار هاوار. كەسوكاری وتیان: ئەرێ ئەوە هاوارهاواری چیتە؟ خۆ تۆ دەنكە گەنم نیت مریشك بتخوا. وتی: «بەڵێ ئەزانم، بەڵام ئێوە بە مریشكەكەی بسەلمێنن كە من دەنكە گەنم نیم!».

٢٥١. مەلا نادرێك هەبوو لووتێكی ناقۆڵای پێوە بوو. ڕۆژێك ئەچێتە ماڵی یەكێ لە قوتابییەكانی. ئەو قوتابییەی برایەكی بچكۆلەی ئەبێ، مەلا نادری چاو پێ نەكەوتبوو. دایكی كوڕەكە لە ترسی ئەوە نەوەك كوڕەكەی كە چاوی كەوت بە لووتی مامۆستا دەست بكاتە قسە كردن، وەیا پێكەنین ناردیە ماڵە دراوسێكەیان.

مەلا نادر هات و دانیشت و باجی ئایشێ بەخێراتنی كرد، بەڵام هەر دڵی لە مستیایە نەوەك كوڕەكەی بێتەوە. لەو كاتەدا كە پیاڵە خاڵییەكە لە بەردەمی خۆیا دائەنێ و ئەیەوێ شتێكی تێكا بۆ مامۆستا پێی ئەڵێ: «مامۆستا شیر بكەمە لووتیەوە یا قاوە؟»!.

٢٥٢. كابرایەك لەگەڵ ژنەكەیا و چوار مناڵیا لە ژوورێكا ئەنوستن. ئەگەر جارێك بیویستایە گەمەوگاڵتەیەك بكەن لەگەڵ ژنەكەیا مناڵەكان لێیان ئەبوون بە «شملیشەڕ» و لێ نەئەگەڕان.

ڕۆژێك كابرا چوو هەندێ گێزەری كڕی هێنایەوە، بە هەر مناڵە مستە نۆكێك و گێزەرێكی دایە، وتی: بچن لە ژێر لێفەكەوە بۆ خۆتان بیخۆن، بەڵام ئەبێ دەنكە دەنكە نۆكەكە بخۆن. ئەگەر هەركەس دوو دوو بیخوا گێزەرەكەی لێ ئەستێنمەوە و ئەیبڕمە قنگی. مناڵان چوونە ژێر لێفەوە خەریكبوون بە نۆكی برژاو خواردنەوە. كابراش بە دڵنیایی لەگەڵ ژنەكەیا دەستی كرد بە ئیشی خێر كردن.

لە پاش ماوەیەك یەكێ لە مناڵەكان ـ كە نۆكەكەی تەواو بووبوو ـ سەری لە ژێر لێفەكە دەرهێنا سەیری كرد ئەوا باوكی سواری دایكی بووە، قیژانی وتی: «مناڵەكان مناڵەكان! تەماشاكەن، وادیارە دایكم نۆكەكەی دوودوو خواردووە، ئەوەتە باوكم گێزەرەكەی تێ ئەبڕێ!».

٢٥٣. لە سەردەمی تورکەکانا کابرایەکی «سمێڵ‌بابڕ»ی کوردی خەڵکی ئەو سەرە بۆ کاسبی ئەچێ بۆ ئەستەموڵ، بەڵام کابرا، کابرایەکی کەڵەمێردی جوانچاك لە دەمەدەمی گەڕانەوەیا بۆ وڵات، ڕۆژێك بەناو کۆڵانێکا تێ‌ئەپەڕێ. ژنە دەوڵەمەندێکی مێردفسر لەسەر بانەوە چاوی پێ ئەکەوێ و ئەزانێ کابرایەکی غەریبە، لە دڵی خۆیا ئەڵێ: ئەگەر لەگەڵ ئەم کابرایەدا ڕێ‌کەوم، بەبێ گومان منداڵێکم ئەبێ و بە تەواوی بنج لەسەر ماڵ و مڵکی مێردەکەم دائەکوتم.

کارەکەرێك ئەنێرێ بەشوێن پیاوەکەدا و بانگی ئەکا و پێی ئەڵێ: من حەز ئەکەم جارێ لەگەڵ تۆدا دروست ببم، بەڵکوو منداڵێکم ببێ. کابرای کوردەی ساڵەها دوورکەوتووی لە ماڵ و منداڵ! وەکوو «بارەشار»ی هاتبێتەوە، وا ئەزانێ و بەتایبەتی ژنەکە هەندێ پارەشی ئەداتێ.

لە وەختی ئیشا کابرا ئەڵێ: «خانم ئارەزووی خۆتە، ئەگەر نیوەی بەرم کوڕەکەت ئەبێ بە یوزباشی، ئەگەر هەمووی بەرم ئەبێ بە بن‌باشی؛ ئیتر تۆ کامت ئەوێ ئارەزووی خۆتە». ژنە ئەڵێ: دیارە حەز ئەکەم ببێ بە بن‌باشی.

کابرا دەست ئەکا بە ئیش، لەو وەختەدا ژنە ـ بلامانێ ـ بایەکی بەدەنگی لێ بەرئەبێتەوە. کابرا ئەڵێ: «داخی گرانم خانم کوڕەکەت بە هیچ گووێك نابێ، تەنها ئەوە نەبێ کە ئەبێ بە بۆڕیەژەنی قشڵە».

٢٥٤. دزێك لە تاریکە شەوێکا چووە ماڵێك بۆ دزی. هەرچەندە گەڕا هیچی دەست نەکەوت. لەبەر زۆر گەڕان تینوویشی بوو، گۆزەڵە شڕێك دانرابوو چووە سەر گۆزەڵەکە سەیری کرد ئەویش کونە و تنۆکێ ئاوی تێدا نییە. بە نسك و ناهۆمێ گەڕایەوە دواوە.

لە گەڕانەوەدا گوێی لە دەنگێك بوو، ڕاوەستا و گوێی ڕاگرت، سەیری کرد ئەمە ژن و مێردەکە ئیشی شەرعییان کردووە و قسە ئەکەن. پیاوەکە بە ژنەکە ئەڵێ: ئەوی من دام بە تۆ هەزار لیرە دێنێ. ژنەش بە پیاوەکە ئەڵێ: ئەوی من دام بە تۆ دوو هەزار لیرە دێنێ. لەم کاتەدا دزەکە تووڕە بوو وتی: «سەگبابینە ئێوە شەوێ سێ هەزار لیرە مامەڵە ئەکەن، کەچی تۆزێ گۆزەڵە شرەکەتان پینە ناکەن، ئەگەر موسوڵمانێك هات، تۆزێ ئاوی لێ بخواتەوە».

٢٥٥. لە تاران دوکتۆرێك شوێنی تایبەتی کردبووەوە بۆ هاتوچۆی نەخۆشەکان. ئەم خانووەی دوو دەرگای هەبوو، یەکێ لە پێشەوە یەکێ لە پاشەوە. دەرگای دواوەیان تێك دابوو خەریك بوون چاکیان ئەکردەوە؛ کرێکار ئیشی تێدا ئەکرد و ڕێگاکەی وای لێ هاتبوو بە کەڵکی هاتوچۆی نەخۆش نەئەهات.

بە شاگردەکەی خۆی ئەڵێ: لەسەر قاقەزێك بنووسێ: «لەبەر ئەوە دەرگای دواوە وێرانە، لە دەرگای پێشەوە تەشریفتان بێت». ئەم پارچەیە بدا بە قەد دیواری خانووەکەوە بۆ ئەوەی ئیتر لەو دەرگای پاشەوە هاتوچۆ نەکرێت، تا چاك ئەکرێتەوە.

شاگردەکە سرێش ئەدا لە پشتی پارچە قاقەزەکە و ئەیەوێ بینووسێنێ بە دیوارەکەوە، لەو کاتەدا دوکتۆر بانگی ئەکا. ئەمیش پارچە قاقەزەکە بە بەرەواژەیی لەسەر کورسییەك دائەنێ و ئەچێ بەدەم دوکتۆرەوە. کوتوپڕ لەو دەمەدا ئافرەتێکی نیوە نەخۆش دێت بۆ لای دوکتۆر و لەسەر ئەو کورسیە دائەنیشێ، قاقەزە تەڕەکەی پێوە بوو. قاقەز ڕاست ئەنووسێ بە شوێنی دانیشتنی ئافرەتەکەوە. ئافرەت بەناو شەقام و کۆڵانا وەکوو

کۆتر ئەڕوا بە ڕێگادا، هەموو ڕێبوارێك کە لە پشتیەوە تێئەپەڕن سەیر ئەکەن ئاگادارییەك بە دەر قنگی خانمەوەیە نووسراوە: «لەبەر ئەوە دەرگای دواوە وێرانە، لە پێشەوە تەشریفتان بێت!!».

٢٥٦. لە جەنگی یەکەما، ئەوە بوو لەشکری هەموو وڵاتێك چووبووە وڵاتێکی ترەوە، ئەڵمانەکانیش چووبوونە فەڕەنسەوە. سەربازی دۆ نەدیوی ئەڵمان خانمەجوانەکانی فەڕەنسە ئەبینن هۆشیان لا نامێنێ و پەلامار ئەدەن. پیرێژنێکی فەڕەنسی سەیر ئەکا کەس بەلای ئەوەوە ناچێ، لەمە زۆر تووڕە ئەبێ ئەڵێ: «ئەی خوا بۆ هەموو کەس جەنگە کەچی بۆ من ئاشتییە».

سەربازێکی ئەڵمانی گوێی لێ ئەبێ لای وا ئەبێ ئەمە جنێوی ئەداتێ، ئەچێت بە شەپەزللە بەر ئەبێتە وێزەی پیرێژنی ئەرامەنە، ئەوەندەی لێ ئەدا ئەمرێ. لە پاش ئەوە کە ئەیخەنە گۆڕەوە نەکیر و مونکەر دێنە سەری. نەکیر لێی ئەپرسێ: خوای تۆ کییە؟ پیرێژن ئەڵێ: تۆ پێم بڵێ تۆ کێیت؟ ئەڵێ: من نەکیرم. ئەویش ئەڵێ: خوا ئینسافت بێ لێرەش هەر نەکیر؟ ئەی کیر لە کوێیە؟

٢٥٧. لە بەغدا گەلێ لە «کوێر»ەکان مۆزیقا لێ ئەدەن. ڕۆژێك پیاوێك بە یەکێ لەو کوێرانە ئەڵێت: کە هەموو ڕۆژێك بچێت بۆ ماڵیان فێری مۆزیقای بکا. کوێرەش ماڵی کابرا نازانێ، کابرا ناونیشانی ماڵەکەی خۆی ئەداتێ کە لە «وزیریە» لە فلان شوێن بە دەستی ڕاستەوە دەرگای چوارەمە، کە پارچە تەختەیەکی بچووك لە تەنیشتیەوە داکوتراوە و ناوی خۆی لێ نووسراوە، ئەوە ماڵی ئەوانە.

کوێرەی مۆزیقار ڕۆژی دوایی ئەڕوات بە ناونیشانەکە ئەچێتە کۆڵانە

و بە پاڵ دیوارەکەدا بە دەست کوتان ئەڕوا. دەرگای یەکەم و دووەم و سێیەم نە، ئەگاتە دەرگای چوارەم لەو کاتەدا بە ڕێکەوت «حەزەرەتی» لە شۆرجە برنج و ڕۆنی بە حەماڵێکا ناردبوو بۆ ئەو ماڵە. حەماڵ کە لە تەنیشت دەرگاکەوە ڕاوەستابوو چاوەڕێی پسوولەی گەیشتنی برنج و ڕۆنەکەی ئەکرد لە فەرەیدوونی خۆمان.

حەماڵە ڕەسمییەکانی بەغدا هەریەکە «باج»ێکیان پێیە و ئەم باجە یا لە قورقوشم وەیا لە شتێکی‌ترە و بەسەر سنگیانەوە هەڵیئەواسن.

کوێرەی مۆزیقار بە دەست‌کوتان کە ئەڕوا لە پێشا دەستی ئەکەوێتە سەر پارچە «باج»ـی حەماڵەکە، وا ئەزانێ ئەمە دەرگاکەیە و ئەمەش پارچەی تەنیشت دەرگاکەیە کە فەرەیدوون پێی وتووە. ئەمجا دەست بەسەر سنگی ئەو حەماڵی بە دەرگا زانیوەدا دێنێتە خوارەوە و دەعبای حەماڵ دێت بە دەستیەوە، ئەو وا ئەزانێ ئەوە ئەڵقەڕێزی دەرگاکەیە، دەست ئەکا بە کوتانی. حەماڵ ئەکەوێتە گرمەگرم و بۆڵەبۆڵ، مۆزیقار وا ئەزانێ ئەمە «عوود»ەکەی شانیەتی وا دەنگی لێوە دێت. دەست لە کێری حەماڵە بەرەڵا ئەکا و بە پەلە دەست ئەبا بۆ عوودەکەی ئەڵێ: «سەگباب خێو! کە من دەرگاکەم کوتا ئیتر تۆ ئەم ئاواز خوێندنەت لە چی؟»

بەم جۆرە فەرەیدوون مامۆستای بۆ خۆی ڕاگیر کرد کە فێری عوود لێدان بێت.

**٢٥٨.** تازە ئوتۆمۆبیلە پاسەکان کەوتبوونە ناو شاری سولەیمانی بۆ هاتوچۆ کردنی خەڵك بەناو شارا، کابرایەکی «مرانە»یی لەگەڵ ژنەکەیا هاتبوونە سولەیمانی و سواری پاس بووبوون. وا ڕێ‌کەوتبوو ژنەکە

لە پێشەوە دانیشتبوو و مێردەکەی لە بەشی دواوە. کابرای مێرد پارەی هەردووکیانی دابوو پاسەکەش پڕی بوو لە خەڵك، لەو ناوەدا کابرا هەستا و بە دەنگی بەرز بانگی کرد لە ژنەکەی: «ئایشێ ئایشێ من لەدواوە داومە، ئیتر تۆ لە پێشەوە مەیدە!»».

٢٥٩. تازە شەڕی یەکەم بڕابووەوە کابرایەکی ئینگلیزی لە ئینگلتەرە قسەی بۆ دۆستێکی ئەکرد وتی: کوردەکان هەتا بڵێیت پیاوی چاکن و خزمەتی میوان زۆر ئەکەن. هەر کە میوانێك ئەچێتە ناویان ئەیبەنەماڵەوە پەزێڕایی لێ ئەکەن. ئەیبەن بۆ گەڕان، ئەیبەن بۆ ناو باخ، شتی خۆشی ئەدەنێ سەر و ڕوومەتی ماچ ئەکەن، بەشەو لە تەنیشت خۆیانەوە ئەینوێنن، لە حەماما دەست بە هەموو لایەکیا دێنن و ئەیشۆن؛ بە کورتی بە هەموو جۆر خزمەتی ئەکەن.

کابرای دۆستی وتی: جا تۆ کەی چوویت بۆ کوردەواری تا ئەم هەموو نەوازشە ببینی؟ ئەوی‌تر وتی: من خۆم نەچووم ئیمساڵ ژنەکەم چووبوو هاتەوە گێڕایەوە!.

٢٦٠. سێ کابرای «سیان» ئەچنە هەولێر، مەنارەی «شێخی چۆلی» ئەبینن، بەلایانەوە زۆر سەیر ئەبێ و هەر سەیری ئەکەن، یەکێکیان ئەڵێ: ئەمە چییە؟ ئەمە بە هەقری من قاربی ئەرزە. یەکێکی‌تریان ئەڵێ: وا نییە، ئەمە بیرەکەی قووچە بلبلاسە هێناویانە لێرە هەڵیان‌گێڕاوەتەوە لۆ ئەوەی ئاوەکەی وشك ببێ دیسانەوە سواغی بدەنەوە. سێیەمیان ئەڵێ: ئەوە ئێوە چ دەرێن؟ ئەمە کێری ئەرزە و ئەچێ بە قوزی خوشکی ئاسمانێدا.

٢٦١. کابرایەکی کورد تەلاقی ئەکەوێ و ئەچێتە لای شێخ بابەعەلی تەکیەیی لە سولەیمانی، ئەڵێ: «یا شێخ هانام هاوردگەسە

درگاکەت تەلاقم خواردگە و منالّدارم». بابەعەلیش ئەلّێ: چیت وتووە؟. ئەلّێ: «قوروان کە من وتم وە ژنەکەم: تەلاقت کەوتوێ، ئەو وتی: شیرٍ!». بابەعەلی ئەلّێ: چۆن شیرێك؟ درێژ بوو یا کورت؟ ئەلّێ: قوروان نە درێژوو نە کورت. ئەلّێ: ئەتوانی بیلّێیت ئەلّێ: بەلّێ قوروان. دوو سێ شیرِی لەوێدا پێ لێ ئەدا. ئەمجا ئەلّێ: ئەتوانی ژنەکەشت بێنی؟ ئەلّێ: قوروان خاس ئەتوانم. ئەو ئەچێ بەشوێن ژنەکەیا.

لەم لاوە شێخ بابەعەلی چەند کەسێك کۆ ئەکاتەوە و چاوەڕێی هاتنەوەی کابرا ئەکەن لەگەڵ ژنەکەیا. ئەمجا دێنەوە. بابەعەلی لە ژنەکە ئەپرسێ ئەلّێ: چۆن بوو؟ ژنەش ئەلّێ: قوروان ئەم دەویت باوکە وتی: هەر سێ تەلاقت کەوتوێ، منیش وتم: شیرٍ، گووت خوارد. بابە عەلی لەوێدا دوو سێ شیرِیش کورت و درێژ بە ژنەکە دائەهێلّێ و ئەمجا پێیان ئەلّێ: بچنەوە مادام شیرِەکە درێژ نەبووە تەلاقەکە ناکەوێ. ئەوانیش ئەلّێن: ئەی وەقوروانت وین.

**٢٦٢.** مەلا ئەوڕەحمان هەبوو لە سولەیمانی، ڕۆژێـك هەندێ لە مەلاکانی وەکوو شێخ بابەعەلی تەکیەیی و شێخ نووری بابەعەلی و مەلا حسێنی پیسکەندی. ڕووی لێ ئەنێن کە بانگێشتنێکی نانخواردنیان بکا، ئەویش ـ سەلامەت بێ ـ هیچی لە دەست نەئەبووەوە. تا ماوەی شەش مانگ بەم جۆرە لەگەڵی خەریك ئەبن، لە ئەنجاما بەلّێنیان ئەداتێ کە بابە ئیمشەو بۆ نانخواردن لە مالّی ئێمە ئەبن و کێش لەگەڵ خۆتان ئێنن بێنن!.

ئەمە خەبەرێکی خۆش بوو؛ بۆ ئێوارە مەلاکان هەندێکیتریش لەگەڵ خۆیان ئەبەن و ئەچن بۆ مالّی مەلا ئەوڕەحمان. بە قسە کردن

ڕایئەبوێرن و خۆیان ئەخلافێنن سەیر ئەکەن هیچ دەنگوباسی نان هێنان نییە. شێخ بابەعەلی خۆی پێ ڕاگیر ناکرێ ئەڵێ: مەلا ئەوڕەحمان برسیمانە کوا نان؟ ئەویش ئەڵێ: قوربان پەلە مەکە. ئەکەوێتە درەنگ، سەیر ئەکەن نان هەر نییە. ئەمجا هەموویان ئەڵێن: مەلا لە برسا مردین کوا نان؟ ئەویش ئەڵێ: «بێ بەلا بن، دوانزە مانگەی خوا نان و گۆشت ئەخۆن با ئیمشەو هیچ نەخۆن چی ئەبێ؟»

بەم جۆرە دەستیان پێوە ئەنێ و هیچیان ناداتێ، بە سکی برسی ئەگەڕێنەوە.

٢٦٣. کابرایەکی جاف هەبوو ئیشی هەر دزیکردن بوو. ئەمجا ئەچێ لەلای «شێخ کەریمی کربچنە» تۆبە ئەکا و ئەبێ بە دەروێشی. شێخ پێی وتبوو ئیتر نابێ دزی بکەی. کابراکەیش چوو بووە کەوڵی و ئیتر هیچی پێ نەئەکرا چاری نەمابوو. ئەمجا ئەچوو بە شەوماڵەکەی خۆی ئەبڕی و ئەچوو لە دەرەوە ئەیشاردەوە و لە بەیانیا ژن و منالٚ هەرایان لێ هەڵئەستا. ئەویش ئەیوت: «کەنیشکە مەیکەن وە گاڵە من لغاوی ئەو شێخەم لە دەمایە ناتوانم بچمە کەلەوەر، خۆم هاتگم بردگمە».

٢٦٤. کابرایەك هەبوو لەو موکریانە سەی عەزیزی ناو بوو، شێت بوو؛ لە پشیلە زۆر ئەترسا. ڕۆژێك کەروێشکێك ئەگرن و ئەیخەنە کۆشیەوە، ئەویش ئەڵێ: کورە بەرمدەن، پشیلە خواردمی. ئەڵێن: کورە پشیلە نییە کەروێشکە. ئەویش ئەڵێ: کوڕ هیزینە پشیلەیە. پێی ئەڵێن: پشیلە گوێی کورتە و کلکی درێژە. کەروێشك گوێی درێژە و کلکی کورتە. سەی عەزیزیش ئەڵێ: «هیزینە کلکی کورت و گوێی درێژە، گوێی درێژ و کلکی کورت نییە؛ مادام چاوی شینە ئیشی خۆی

هەر ئەکا و ئەمخوا!».

٢٦٥. جارێـك یەکـێ لـە حافزەکانـی مزگەوتی گەورەی سولەیمانی ئەچێتە حەوزی وسڵخانەکە مەلە ئەکا. خاڵە فڵانیش لەسەر حەوزەکە تارەت ئەگرێ، حافزەکە کە ئەچێتە ناو حەوزەکە چاوی نابینێ دەستی ئەکەوێ لـە شتێکی نەرمی ئەستووری شلەپەتە، بانـگ ئەکا: خەڵکینە ئەمە منالێکە کەوتۆتە ناو ئەم حەوزە، من لێم ون بوو بێن دەری بێنن. خالێشم ئەڵێ: «بابم ئحم! هاوار مەکە ئەوە ئالەتەکەی منە».

٢٦٦. کابرایەك هەبوو لـە سولەیمانی با بڵێم «مەلا سمایل»ـی ناو بوو، هەتیوباز بوو. جارێك لە کەرکووك کوڕێك بەگیر دێنێ و ئەیباتـە شوێنێك. کـە دێنە دەرەوە کوڕێکی‌تر تووشـی ئـەو کوڕە ئەبێ و کەینوبەینی لێ ئەپرسێ. ئەڵێ: وەڵڵا ئەو کابرایە بردمی بۆ ئەوە سواری خۆیم کا. کابرا ئەم قسەیە ئەبیسێتەوە ئەڵێ: «ئەوا هەتیوبازیش حەرام بوو مەگەر بە حوزووری وەلی و دوو شاهید نەبێ!».

٢٦٧. مەلایەك جارێ وەعزی ئەدا و لە ناوەندی وەعزەکەدا گەیشتە سەر باسی مەلایکە و وتی: شوکر بکەن شوکر بکەن. هەموو خەڵکەکە دەستیان کرد بە شوکر کردن؛ لە پاشا وتیان: مامۆستا ئەم شوکرە بۆچی بوو؟ وتی: «بۆ ئەوە بوو کە خوا ڕەحمێکی گەورەی پێ‌کردووین. ئەگەر مەلایکەکان پیساییان هەبوایە لەو سەرەوە ئێمەیان ئەکرد بە ژێر پیساییەوە و جلەکانمانیان هەموو لە نوێژ ئەبرد.

٢٦٨. هەتیوێکی قومارباز هەبوو لە سەقز «مۆلە»ی ناو بوو، ئیشەکەی ماسی فرۆشتن بوو لەناو شارا. ڕۆژێ دوو ماسی پێ ئەبێ ئەگاتە

بەر دەرگای ماڵێك. خانمێكی كاشانی ـ كە مێردەكەی سەرگورد بوو و بەهۆی وەزیفەوە كەوتبوونە ئەوێ ـ بەدەنگی هەی ماسی مۆلەوە دێتە بەر دەرگای حەوشە. دڵی ئەچێ لە ماسییەكان، لەو كاتەشا پارەی پێ نابێ، لەگەڵ مۆلەدا ڕێ ئەكەون كە پێكەوە بنوون و یەكێ لە ماسییەكانی بداتێ. ئیش ئەكرێ و مۆلە ماسییەكی ئەداتێ. خانم ئەڵێ: ئەگەر ئارەزووت لێیە یەكێكی‌تر و ماسییەكەی‌تریش. مۆلە پێی خۆش ئەبێ ئەڵێ: باشە. مۆلە هەردوو ماسییەكەی لە دەست دەرئەچێ.

مۆلە كە دەستی لە قنگی هەمانەی بەتاڵەوە دەرئەچێ، لەبەر قاپی حەوشەكەدا دائەنیشێ داوای هەندێ ئاوی خواردنەوە ئەكا. خانم لەناو گلێنەیەكدا ئاوی بۆ دێنێ. مۆلە كە ئاوەكە ئەخواتەوە گلێنەكە دائەخات و ئەشكێ. ئەمجا دەست ئەكا بە گریان. لەو كاتەدا ئاغای سەرگوردی مێردی خانم دێتەوە، سەیر ئەكا ئەوا ئەم كوڕە لەبەر قاپییەكەی ئەوانا دانیشتووە و ئەگری. لێی ئەپرسێ: بۆچی ئەگریت؟ ئەڵێ: قوربان دوو ماسیم پێ بوون هاتم لێرە داوای تۆزێ ئاوم كرد، ئەم خانمە نەختێ ئاوی لەناو ئەم گلێنەیەدا دامێ. كە ئاوەكەم خواردەوە گلێنەكەم لە دەست كەوتە خوارەوە و شكا. ئێستە خانم لەباتی گلێنەكە دوو ماسییەكەی لێ گل داومەتەوە. منیش لە ترسی وەستاكەم ناوێرم بچمەوە و خانمیش ماسییەكانم ناداتەوە. ئاغای سەرگورد كە گوێی لەمە ئەبێ ڕوو ئەكاتە خانم و ئەڵێ: خانم‌جان عەیبە! گلێنەیەك نرخی چییە وا تۆ لەباتی ئەوە ئەو دوو ماسییەت لەم بەسەزمانە گل داوەتەوە؟ پێی بدەرەوە بابڕوا گوناحە. خانم چار ناچار ئەچێ دوو ماسییەكە دێنێتەوە و ئەیداتەوە بە مۆلە. مۆلە بە خۆی و ماسییەكانەوە ئەڕوا و خانمیش ناوێرێ دەنگ بكا كە كارەسات وا نییە.

٢٦٩. مەلا عەلی حاجی مەحموو هەبوو لە سولەیمانی ڕۆژێ لە خانەقای حاجی مەلا عەلی خەریکی دەستنوێژ شتن ئەبێ. سەری دەعباکەی گرتبوو، ئەهات و ئەچوو ئەکۆکی و سەرەکەی گرتبووە دەست و ئەیسوو بە دیواری بەر ئاودەستەکەدا «اِستِبرا»ی ئەکرد. «مەجۆل»ی خامەش لەوێ هەر دەستنوێژ ئەشوا ئەڵێ: ماموٚستا ئەوە بۆچ دیوارەکە کون ئەکەی؟ مەلا عەلیش ئەڵێ: «مەجۆل بەو ڕەقی و قایمیە نەماوە کە تۆ دیوتە!».

٢٧٠. کابرایەکی دەرۆزەکەر ئەچێتە بەر دەرگایەك و ئەڵێ: خێرتان بنووسێ شتێکم بدەنێ. لەو کاتەدا ژن و مێردەکە لەژوورەوە خەریکی ئیشی خێر ئەبن. ژنەکە لە ژێرەوە جارجار نەرمە زیلەیەك ئەدا لە مێردەکەی!. کە سواڵکەرەکە ئەو قسەیە ئەکا، ژنەکە ئەڵێ: خوا بتداتێ. کابرای دەرۆزەکەر هەر واز نایەنێ: ئەوەی ئەیخۆن لەوە شتێکم بدەنێ. ژنەکە ئەڵێ: من کێر ئەخۆم و مێردەکەم زیلە، ئەگەر ئەتەوێ فەرموو». کابرای سواڵکەر لێ ئەدا و ئەڕوا و ئەڵێ: «ئەم نیعمەتە خوا هەر بە خۆتانی ڕەوا ببینێ!».

٢٧١. لە سابڵاخ کابرایەکی تەورێزییان گرتبوو بەرەواژە سواری کەریان کردبوو و بەناو شارا ئەیانگێڕا و لێیان ئەدا. یەکێ پرسی: ئەمە چی کردووە؟ وتیان: جنێوی بە ئەبووبەکر و عومەر داوە. کابرای کەرسوار گوێی لێبوو وتی: عوسمانیشتان لەبیر نەچێ.

٢٧٢. کابرایەك زستان بوو خەریکی پیرێژنێ بوو. لە کاتی ئیش کردنا دەری هێنا پیرێژنەکە وتی: ئەوە چی ئەکەی؟ کابرا وتی: «وەڵڵا تاقی ئەکەمەوە بزانم ناوەوە ساردترە یا دەرەوە؟».

٢٧٣. فایق بێکەس لە سولەیمانی فێر بووبوو بە «کەسپەڕ»ی عەرەق‌فرۆش، هەر ئەچوو عەرەقی لێ ئەسەند و ئەیوت: لەسەر حساب بینووسە، فلسی نەئەدایە.

ڕۆژێك ئەچێ داوای قاپێ عەرەقی لێ ئەکا و هەر لە دووکانەکەشیا دائەنیشێ بۆ خواردنەوەی. کەسپەڕیش قاپە عەرەقێکی زۆر تورشی بۆگەنی ناخۆشی بۆ دێنێ؛ چونکە ئەزانێ پارە نادا. فایق هەمووی ئەخواتەوە و گوێ ناداتێ، لە کاتی هەستانا تەنها دوو دیناری پێ ئەبێ دوو دینارەکە ئەدا بە کەسپەڕ. کەسپەڕ زۆر سەرسام ئەبێ، ئەڵێ: کاك فایق ئەمە گەلێکی زیادە لە نرخی قاپە عەرەقەکە. فایقیش ئەڵێ: من نرخی قاپە عەرەقەکە نادەم، نرخی ئەو وەستایەتییەی تۆ ئەدەم کە چۆن توانیوتە لە قنگێکی وا فراوان بڕیتیە قاپێکی وا تەنگەوە!».

٢٧٤. «عەلی ئوفیك» شەوێك لە نادی ئەبێ، سەرخۆش ئەبێ و هەڵئەستێ و ئەچێتەوە بۆماڵەوە. لە ڕێگادا ئەکەوێ و ناتوانێ بڕوا. «دەوریە» تووشی ئەبن و نایناسن ئەڵێن: هەستە با بچین بۆ پۆلیسخانە. ئەویش ئەڵێ: دە جا ئەگەر من بمتوانیایە بە ڕێگادا بڕۆم، ئەچوومەوە بۆ ماڵی خۆم». پاشان ئەیناسن و ئەیبەنەوە بۆ ماڵی خۆیان.

٢٧٥. لەوبەر کێو، هەموو ئێوارەیەك مامۆستا وەعزی ئەدا. ئێوارەیەکیان وتی: هەرکەس بە شەوی جومعە لەگەڵ خێزانەکەی خۆیا دروست ببێ قەسرێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست ئەکرێ.

ژنێك لە کۆڕی وەعزەکەدا بوو، هەستا گەڕایەوە و ئەو ئێوارەیەش جومعە بوو، بە مێردەکەی خۆی وت: پیاوەکە مامۆستا وای فەرموو. ئیمشەو جومعەیە با کۆشکێك لە بەهەشتا دروست کەین. کۆشکێکیان

دروست کرد. زۆری پێ نەچوو ژنە وتی: پیاوەکە ئەوە بۆ تۆ بوو، با کۆشکێکیش بۆ من دروست کەین. کۆشکێکیان بۆ ئەویش دروست کرد. پاش ماوەیەك ژنەکە وتی: پیاوەکە ئەگەر میوانێکمان هات لەکوێ داینین؟ با کۆشکێکیش بۆ ئەو دروست کەین. بەڵێ، میوانخانەیەکێشیان دروست کرد.

پیاوە سەیری کرد ئەگەر بەم جۆرە پێوە برۆن، ئەوەندەی کۆشك ئەبێ لە بەهەشتا سەری لێ دەرناکا. ژنە هات بیەوێ قسە بکا پیاوە پێش ئەوە ئەو قسە بکا هاتەوە کار، بەڵام کردی بە شوێنێکی‌ترا؛ ژنە وتی: چیت کرد؟ پیاوە وتی: «ئافرەت هەرکەس سێ کۆشکی لە بەهەشتا هەبێ ئەبێ خانووە شڕێکیشی لە جەحەنەما هەبێت!».

٢٧٦. کابرایەك هەبوو «فەتالی» ناو بوو، کەرێکی هەبوو ئەیباتە سنە بیفرۆشێ. ئەچێتە مەیدانەکە، جامبازەکان دەوری لێ ئەدەن: بە چەند نە بە چەند. بە پێنج تمەن رێ ئەکەون. کابرا ئەڵێ: کە پێنج تمەن بێنێ شەش دێنێ، لە شەش تمەن کەمتری نادەم. ئەملاوئەولا بۆی ئەکەنە شەش تمەن. ئەمجا کابرا ئەڵێ: کە شەش تمەن بێنێ، حەوتیش دێنێ، لە حەو تمەن کەمتری نادەم! دیسان ئەبێتەوە بە هەرا و بۆی ئەکەن بە حەو تمەن. دیسان ئەڵێ: کە حەو تمەن بێنێ هەشتیش دێنێ، لە هەشت تمەن کەمتری نادەم. بە کورتی ئەچن تا دە تمەن. کابرا هەر ڕازی نابێ و ئەڵێ: کە ئەوەندە بێنێ ئەوەندەش دێنێ. ئەوانیش ئیتر لێی ناکرِن و ئەگەڕێتەوە.

دێتە ئەملا، دەستەیەکی‌تری لێ پەیدا ئەبێ ئەڵێن: کەرەکەت بە چەند؟ ئەڵێ: بە دەتمەن. ئەڵێن: نایەنێ، بە نۆ تمەن. ڕازی ئەبێ،

یەکێکی تر لەولاوە ئەڵێ: نایەنێ بە هەشت تمەن. بە هەشت ڕازی ئەبێ. کابرای یەکەم ئەڵێ: بابە نایەنێ بە حەو تمەن. ئەم ڕازی ئەبێ و ئەوان ڕازی نابن، بە کورتی هەر جارە تمەنێکی بۆ ئەشکێنن تا ئەیهێننە سەر یەك تمەن ئەڵێ: «بێنن تمەنەکە، ڕیشی تەماعکارێکی وەکوو من هەر بۆ ئەوە باشە بچێ بە قینگی جامبازێکی وەکوو ئێوەدا، بەم جۆرە بڕۆین یەکەمجار من کەرەکەم بۆ مایەوە ئێستە خۆیشمم بۆ نامێنێتەوە».

٢٧٧. کابرایەك هەبوو لەو سەرە گەڕی ئالاندبوو بە هەتیوێکا، کوڕەکەش ئەیوت: نابێ و ناکرێ؛ خەڵك پێمان ئەزانن حەیای من ئەچێ. کابراش وتی: بابە پاش ئەوە کە بەخێر لێ بووینەوە من تۆ ئەخەمە سەر شانم بەناو بازاڕا ئەتگێڕم تۆ بانگ بکە بڵێ: من ئەم کابرایەم گاوە. کوڕەکەش وتی: باشە و ئیش دروست بوو. پاشان سواری سەر شانی خۆی کرد و کوڕە هاواری ئەکرد و ئەیوت: «من ئەم کابرایەم گاوە». کابراش لە ژێرەوە و بەدەم ڕێگا ڕۆیشتنەوە ئەیوت: «ئەهلی کار خۆیان ئەیزانن!».

٢٧٨. لەو وڵاتی «باسنێ» و «ڕەشەکانی»ـیە مەلایەك هەبوو مەلا عەبدوڵڵای ناو بوو. ڕۆژێك قسە لە زانیاری خۆی ئەکا و ئەڵێ: من هەموو عیلمەکانم خوێندووە، تەنانەت «هەندەسە»ش زۆر چاك ئەزانم. یەکێك پێی ئەڵێ: مامۆستا لە حسابا چۆنێت؟ وتی: «حساب هەمووی ئەزانم کەس وەکوو من نایزانێ. من لە یەکەوە باش ئەینووسم تا نۆ، بەڵام کە دێتە سەر دە نازانم نوختەکەی لەلای ڕاستەوە دائەنرێ یان لەلای چەپەوە؛ ئەگینا زۆر چاکی ئەزانم!».

٢٧٩. مەلایەك هەبوو لەو سەرە «مەلا بامۆك»یان پێ ئەوت، بە مناڵانی ئەخوێند. ئەو مناڵانە کە لایان ئەخوێند مناڵێکی

جوانکیلەیان لەناوا بوو «عەول»ی ناو بوو. مەلا بامۆك بە جوانکەلەیی مناڵەکە بۆی دەرکەوت کە دایکی جوانە. ڕۆژێ بە عەولی وت: ڕۆڵە بە دایکت بڵێ: مامۆستام سەلامت لێ ئەکا. ئەویش پێی وت: دایکیشی پێی وت: ڕۆڵە پێی بڵێ: سەلامی خوای لەسەر بێ و خوا ڕاوەستاوی کا. کە عەول ئەمەی بە مامۆستای وت، مامۆستا تۆزێ خۆی قیت کردەوە و لە دڵی خۆیدا وتی: ڕێکەوتووە. ئیتر بەین‌بەین سەلامی ئەنارد بۆ دایکی عەول و دایکی عەول هەستی کرد کە چییە بە مێردەکەی وت. مێردەکەشی وتی: ئاسانە، تۆ ڕۆژێ بەناو دۆستی و دڵ لێچوونەوە بانگی کەرەماڵەوە جا ئەو وەختە ڕێگای خۆی ئەدۆزێتەوە.

دایکی عەول، هۆڕێ گەنمیان دانابوو بۆ بروێش، دەستاڕێکیان لەلاوە دانابوو بۆ ئەوە بیکەن بە دەستاڕەکەدا، خەریکی ڕێکخستنی ئەم تفاقە بوو، بە کوڕەکەی وت: ڕۆڵە بە مامۆستات بڵێ: با ئیمڕۆ بۆ قاوەڵتی بێت بۆ ماڵەوە و باوکیشت لە ماڵ نییە. عەول چوو دایکی چی پێ وتبوو بە مامۆستای وت. مامۆستا جامانەکەی بەستەوە و ڕیشووەکانی بەردایەوە و هەر چاوێکی مستێ کلی تێکرد و چوو بۆ ماڵی دایکی عەول. دایکی عەول ماریفەتێکی زۆری لەگەڵ نواند، مەلا بامۆك ئیتر بە تەواوی هاتە سەر پێی.

لەو وەختەدا تەقەی دەرگا هات، دایکی عەول وتی: ئەیەڕۆ ئەوە مێردەکەم هاتەوە، ئێستە هەردووکمان هەنجن‌هەنجن دەکا. مەلا بامۆك وتی: چیم لێ ئەکەی؟ دایکی عەول وتی: بەم پەلەپەلییە لەوە زیاتر ناکرێ، هەستە ئەو عەبایە بدە بە سەرتا و لەسەر دەستاڕەکە دانیشە و دەست بکە بە دەستاڕ کردن، من جوابی مێردەکەم ئەدەمەوە. مەلا بامۆك هەر خێرا عەبای دا بە سەریا و نیشتە سەر دەستاڕەکە و دەستی

کرد بە بڕێ لێکردن. مێردە کردی بە ژوورا و دانیشت، وتی: ئۆ ئافرەت ئیمڕۆ زۆر ماندوو بووم. وتی: بۆچی؟ وتی: هۆڕێکی‌تر گەنمم هێناوەتەوە، ئەترسم ئەوە بەشمان نەکات با ئەم هۆڕەشی لەگەڵ بێ. مەلا باموکیش عەبای داوە بە سەریا و پشتی کردۆتە ئەمان و خەریکی هاڕەهاڕە.

مێردە وتی: ئەو ئافرەتە کێیە وا هاڕە ئەکا؟ ژنەش وتی: وەڵڵا پیاوەکە ئەوە میمکە «بەسێ»ی دراوسێمانە ـ خوا کاری ڕاس بێنێ!ـ هات وتی: من هارەکەتان بۆ ئەکەم. پیاوەش وتی: یاخوا بەخێر بێی میمکە بەسێ، ئەترسم عەزیەت بێ بۆت. میمکە بەسێش ورتە لە دەمیەوە دەرنایە هەر خەریکی هارە کردنە. پیاوە وتی: ژنەکە ئەوە میمکە بەسێ بۆچ دەنگ ناکا؟ ژنە وتی: پیاوەکە لێی گەڕێ، هەژارە گوێرێژکەی کەڕ بووە. پیاوە وتی: ئافرەت وا دیارە ئێستە میمکە بەسێ قسە نابیەت، ئەوی ڕاستی بێ من خۆمم لێ‌خۆش کردووە، چونکە ئەم میمکە بەسێیە لە وەختی خۆیا گەلێ بوختانی بە تۆوە ئەکرد و بە تەواوی ئابڕووی منی بردبوو، ئێستە ئەبێ هەقی بەر و دوای لێ بکەمەوە، ئەو ساوەرەشم ناوێ کە ئەو بیهاڕێت.

ژنە وتی: پیاوەکە ئەیەڕۆ عەیبە! خەیاڵی وات نەکردبێ، ئێستە میمکە بەسێ لە سەرەی ئەوەدا نەماوە واز بێنە تا بڕوێشەکەی بهاڕێ.

مەلا باموکیش کە گوێی لەم قسانە ئەبێ بە تەواوی ناوکی ئەکەوێ، غەیری بڕوێش کردن نەبێ ناوێرێ هیچ دەنگ بکا.

تەنگی بە هۆڕەگەنم هەڵچنی. چاوەڕێی دەرفەتێکە بۆی دەرچێ کە هۆڕەگەنم هەمووی کرا بە بڕوێش، پیاوەی مێردە کەوتە جموجووڵ. مەلا باموك سەیری کرد ئیش زۆر خراپە، هاتە پێشەوە بە بیانووی پشوودان و سەرئاودەستەوە عەباکەی بە پوختی لە خۆیەوە پێچا و بەبێ خشپە

هەستا چووە دەرەوە، ئەمانیش گوایە نایزانن میمکە بەسێ هەستاوە. مەلا باموك لەناو ئەم ترس و لەرزەدا بە هەرجۆر بوو خۆی ڕزگار کرد و فرتەی بۆ کرد بۆلای مناڵەکان و لە دەریشەوە عەباکەی فڕێ دا.

لە پاش چەند ڕۆژێك دایکی عەول بە عەولی وت: ڕۆڵە بە مامۆستات بڵێ: دایکم سەلامت لێ ئەکا. عەولیش ئەم سەلامەی بە مامۆستای گەیاند. مامۆستای وتی: زۆڵەی بەچکەزۆڵەن ئەوە بۆچی ساوەر و بڕوێشەکەتان دوایی هاتووە؟!

٣٨٠. پیاوێك هەبوو لەو سەرە «فەتە»ی ناو بوو، ژنێکی هەبوو ناوی «سەمەن» بوو. فەتە و سەمەن گەلێ ساڵ بوو پێکەوە هاوسەر بوون و چەند مناڵێکیش کەوتبووە بەینەوە. ڕۆژێك سەمەن هات بەسەریا و لە فەتە تۆرا و ماڵی بەجێ‌هێشت. فەتە لە ماڵ نەبوو، کە هاتەوە سەیری کرد ماڵ و مناڵ بێ خاوەن و سەمەنیش دیار نییە، لە ئەنجاما تێ‌گەیشت کە ئەمە سەمەن تۆراوە. یەك دوو ڕۆژ وازی لێ هێنا، سەمەن هەر دیار نەبوو؛ پاشان دراوسێیەکیان هەبوو ناردی بەشوێنیا. سەمەن وتی: تازە ئیتر نایەمەوە بەو ماڵەدا.

بەینێکی‌تری پێ چوو، یەکێکی‌تری نارد بەشوێنیا هەر کەڵکی نەبوو. ناچار چووە لای باپیراغا و پێی وت: سەمەنی ژنم تۆراوە وا هەرچەند ئەکەم نایەتەوە. باپیراغاش «گوڵە»ی کچی خۆی نارد بە شوێنیا. ئەویش هەرچەند ئامۆژگاری کرد، بۆ ئەوەی بچێتەوە لای فەتە، هەر کەڵکی نەبوو.

فەتە هانای بردە لای مەلا کە بەڵکوو ئیشێکی وا بکا سەمەن بگەڕێتەوە. مامۆستاش بە ڕیشە سپییە جوانەکەیەوە عەساکەی گرت بە دەستەوە و چوو بۆلای سەمەن، پێی وت: دایکم! شەرع ئەفەرموێ: ئافرەت ئەبێ

لە ژێر ئیتاعەی مێردا بێ و نابێ لە ئەمری دەرچێ. ئێستە لەسەر چی تۆراویت؟ ئەم تۆرانەت موخالەفەی شەرعە و هەستە بڕۆرەوە ناو ماڵ و منداڵەکانت و چاوەدێری ماڵەکەی خۆت بکە، ئەوا من بە ڕیشی سپییەوە هاتم بە شوێنتا لە شاخی شەیتان وەرە خوارەوە، هەستە پێشم کەوە با بچینەوە. سەمەن وتی: مامۆستا عەزیەتی خۆت مەدە، جارێکی‌کە من نایەمەوە لای فەتە، خوات لەگەڵ بێ، زەحمەتت کێشا! مامۆستا بە ناهومێدی گەڕایەوە.

فەتە ئیتر دەستی لە هەموو لایەك بڕا و ئیتر سەرلەئێوارەیەك لەسەر سەرەنوێلکەکە دەستی دابووە ژێر چەناکەی و کەوتبووە ناو دەریای خەم و پەژارەوە «باجی عاسم» هەبوو، لەو کاتەدا و لەو حاڵەدا چوو بە سەریا. باجی عاسم یەکێك بوو لە جانانەکانی زەمان. دەموپلەکەی هەڵۆی لە ئاسمان ئەهێنایە خوارەوە.

جا باجی عاسم ڕووی کردە فەتە و وتی: فەتە ئەوە چییە وا دوشداماوی؟ وتی: باجی عاسم بێژم چی؟ سەمەنی ژنم تۆریاگە ئەوا کول و کافر بووم لەگەڵی نایەتەوە؛ خۆم و منداڵەکانی سەرگەردان کردگە. باجی عاسم وتی: هەروا؟ ئا بزانە ئەو وا وا لێ‌کراوە چۆن بە شەق ئەهێنمەوە. ئەمەی وت و لێی دا ڕۆیشت.

کە ڕۆیشت سەیری کرد وا سەمەن لە بن گوێسە بانەیەکا دەمێ بنێشتی لە دەمایە ئەیجوێ. لەگەڵ دوو سێ ژنی‌ترا دانیشتبوون هیلکەهیلك پێ‌ئەکەنێ و داویەتە ڕاوی قسە. باجی عاسم هەر لە دوورەوە شێتانی و ڕووی تێ‌کرد و وتی: «ئەرێ هەی قەحبەی ماکەری ئابڵاخ! ئەرێ هەی دێڵەسەگی دەساچۆی دەستی هەتیوان! ئەوە بۆچ ناچیتەوە لای ئەو پیاوە؟ ئەوە ئەو منالانەت بۆ بەرەلا کردووە؟ هەستە هەستە پێشم کەوە هەتا

بە شەق گەلۆقنگم نەکردووی بە یەك. کۆنە حیزەی دێلەسەگ هەستە ڕاست بەرەوە».

هەر کە باجی عاسم ئەمەی لە دەم هاتە دەرەوە سەمەن وەکوو کێچ ڕاپەڕی و چارۆکەکەی دا بە سەریا و وتی: «باجی عاسم گیان! کەی ئەو پیاوە بێفەڕە یەکێکی نەجیمی وەجاخزادەی نارد بە شوێنما و من نەهاتمەوە. ئەوا ئێستا تۆ هاتی، بزانە چۆن لەگەڵت دێمەوە؟ فەتە با خراپیش بێ دڵی تۆ ناشکێنم». وەڵڵا وەکوو شەکرۆکە پێشی کەوت و هاتەوە.

٢٨١. کابرایەك لەو بەر کێوە کەرێکی ئەگا. کابرای خاوەن کەر چوو بە سەریا و وتی: کوڕە ئەوە چی ئەکەی لەوێ؟ وتی: وەڵڵا با هێناومی. وتی: ئەی بۆ کلکی ئەو کەرەت خستۆتە بن دەستتەوە؟ وتی: وەڵڵا ئەوە خۆمی پێ ئەگرمەوە بۆ ئەوە بایەکە لەمە زیاتر نەمبا.

سەیری کرد کەڵکی نییە، چوو چاکەتەکەی هەڵدایەوە سەیری کرد دەعباکەی لە وانێکی کەرەکەدایە، وتی: ئەی ئەمە چییە؟ وتی: «وەڵڵا قوربان منیش سەرم لەوە سووڕ ئەمێنێ چۆن چووەتە ئەوێوە؟!».

٢٨٢. لە کۆڕێکا دوو کابرا کەوتنە دەمەقرە. یەکێکیان هەر تێنەدەگەیشت. ئەویتریان ڕووی کردە کۆڕەکە و وتی: «کوڕە وازی لێبێنن، وە چل قورحان تا گوو نەکا، نازانێ قنگی لە کوێوەیە؟».

٢٨٣. لەو سەرە کابرایەکی ئاوکێش هەبوو پێیان ئەوت: «شیرمەردە». کەرێکی هەبوو هەموو جار بە کەرەکەی ئاوی بۆ ماڵی قازی ئەبرد. پارەی ئاوکێشانێکی زۆری کەوتبووە سەر قازی و هەر نەیئەدایەوە، ئیمڕۆ و سبەی پێئەکرد، سەرباری ئەمەش کەرەکەشی تۆپی. ئەمجا داوای کرد لە قازی کەوا کەرەکەشم نەماوە، ئەو پارەیەم کە لەلاتە بمدەرێ

با کەرێکی تری پێ بکڕم. ئەمجا کە ئاوم بۆ هێنان ئیتر هیچ پارەم ناوێ. قازی پێی وت: ئێستە پارەم نییە، بەڵام بچۆ یەکێك بدۆزەرەوە کەری هەبێ بیهێنە من بۆت چار ئەکەم.

کابرا چوو گەڕا جوولەکەیەکی دیەوە کە کەرێکی چاکی هەبوو. گەڕی پیا ئاڵان و پێی وت: ئەم کەرە هی منە. جووە هەر واقی وڕ ما، وتی: باوکم! کەر کەری خۆمە. کابرا وتی: نابێ ئەم کەرە هەر هی منە؛ ئەگەر قایلیش نابی وەرە بچین بۆ شەرع بۆلای قازی. جووە بە ناچاری بە خۆی و کەرەکەیەوە شوێنی کەوت و چوون بۆلای قازی. شیرمەردە بە قازی وت: قوربان ئەم کەرە هی منە و جووە زەوتی کردووە نامداتەوە؟ قازی رووی کردە جووە و پێی وت:

**تۆ لەو کەسانەی کە ئیماندارن   یا لەو کەسانەی کە بەدکردارن؟**

جووە زانی دنیا چ باسە وتی: قوربان!

**نە ئیمانـدارم و نـە بەدکردارم   نە خاوەن ماڵـم وە نە کەردارم**
**هەڵدێـم و ئەڕۆم هـەدە هەدە   کەر بەجێ دێڵم بۆ ئەم شیرمەردە**

٢٨٤. دکتۆر ئەحمەد گێڕایەوە وتی: لەو خۆشناوەتییە کە یەکێك ئەمرێ، بەتایبەتی ئەگەر یەکێکی تۆزێ گەنج وەیا پیاوێکی ناسراو بێ، ژنان لە کۆڕی شینا دائەنیشن بۆی ئەگرین. یەکێك لە ژنەکان کە هەر ئیشی ئەوەیە شت ئەڵێت بە باڵای مردووەکەدا، ئەوانی تریش لە سنگیان ئەدەن و ئەڵێن: وابوو. وتی: جارێك کوڕێکی گەنج لە «هەرتەل» مردبوو. ئەو ژنە خوریاکەرەکە ـ واتە سەردەستەکە ـ ئەیلاواندەوە و ئەیوت: «بەنان» بوو، ئەوانی تریش لە سینگی خۆیان ئەدا و ئەیانوت: وابوو. دەستی لە تفەنگ بوو، وتیان: وابوو. وتی: قیتکەی تاشان بوو،

وتیان: وابوو. وتی: کوڕی ئاشان بوو، وتیان: وابوو. وتی: ڕاوکەری بەرماران بوو، وتیان: وابوو. وتی: بە قاوە و قلیان بوو، ژنەکان دایان لە سنگیان و وتیان: ئەوەی تە قوونێدا نەبوو.

٢٨٥. ژنێك کچێکی هەبوو دابووی بە شوو. کچە ملی نەئەهێنایە ژێر بار بۆ مێردەکەی و خۆی نەئەدا بەدەستەوە. چەند شەوێکیان بەم جۆرە تێپەڕاند، کوڕەی زاوا چووە لای خەسووەکەی شکاتی کرد کە کچەکەی خۆی نادا بەدەستەوە. دایکی کچەکە چووە لای کچەکەیەوە و پێی وت: ڕۆڵە ئەوە بۆ خۆت نادەی بەدەستەوە؟ بەسیە ئیتر عەزیەتی ئەو هەژارە مەدە. کچەش وتی: دایە دەعباکەی دەعبا نییە! هەرچەندە چاوم پێ ئەکەوێ زەنەقم ئەچێ و ئەترسم ورگم هەڵدڕێ.

دایکەکەش وتی: «ڕۆڵە، ئەیەڕۆ دەعبات نەدیوە؟ دەعبا دەعباکەی باوکی ڕەحمەتیت بوو! هەرچەند ئەیکێشا بە دایکتا وردە ئاهەنگ و گیز و هۆڕی پاشی، شڵەژەی ئەخستە ئاوایی و مەڕ و ماڵاتی لەمسەر ئەگێڕایەوە بۆ ئەوسەر. کچم دیارە بەختێکی تۆزێ باشت هەیە، واز بێنە خوا پێی داوی لەوە زیاتر ئاو مەزایەنە ناو دەمی دایکت!.

٢٨٦. کابرایەکی سەید ژنێکی دۆستی ساز کردبوو. خۆی کوتابووە پاڵی، لەو وەختەدا کە کوتەکەکەی پێوە ئەدا ژنەکە وتی: مامە سەید ئەترسم خەڵکوخوا بوختانمان بۆ هەڵبەستن و حەیامان بچێت. مامە سەیدیش وتی: «ئەوی بوختانمان بۆ هەڵئەبەستێ جەدی گەورەم ﷺ ئەدا لە بن دەستی».

٢٨٧. دوو ژن بووە شەڕیان. یەکێکیان بە ئەوی‌کەیانی وت: بچۆ بەولاوە هەی واوا لێ‌کراوی حەمەسەن گاو، ئەوە چۆن لە ڕووت

هەڵدێ قسە ئەکەی؟ ئەویش وتی: «هەی کۆنە قەرەج؛ حەمەسەن منی گاوە یا تۆ؟» کوتوپڕ لەو وەختەدا حەمەسەن بەوێدا تێپەڕی، ژنەکە ڕووی تێکرد و وتی: توخوا خاڵە حەمەسەن ئەم کۆنە لۆتییە دەستە چەورەکەی خۆی ئەهێنێ بەسەر منا ئەسوێ ئەڵێ: تۆ منت گاوە؟ تۆ کەی منت گاوە؟ خاڵە حەمەسەنیش وتی: «کام جاریان ئەڵێیت؟!».

٢٨٨. کابرایەك شەوێ بە ژنەکەی ئەڵێ: ژنەکە بەیانی ئەچم بۆ شار نەختێ کەلوپەل ئەسێنم و ئەچمە لای کێروەستایەکیش. کاوراکە بڕێ کۆڵ بووە دەمەنیایەکی ئەویش ئەکەمەوە؛ تۆیش چیت گەرەکە تا بۆت بێرم؟

ژنە ئەڵێ: خوا نەیوڕێ گشت شتێك هەس، هیچم نەگەرەکە بەلام کە چوویتە لای کاورای وەستا بۆ دەمەنیا، پێی بێژە پانی بستێك و درێژی دوو بست وێ وەو جۆرە دەمەنیای بکاتەوە، جا خۆیشت چی‌ترت گەرەکە پێی بێژە.

٢٨٩. حاجی ئەوڕەحمانی کۆیی هەبوو، جارێك ئەچێ بۆ ئەو خۆشناوەتییە و ماوەیەك ئەمێنێتەوە. خۆت ئەزانی ناشوکری نەبێ خواردنی هەرە خۆش لە خۆشناوەتی هەر گەنمە کوتاوە. ئەویش لەو ماوەدا لە گەنمەکوتاو بەولاوە هیچی‌تری دەست ناکەوێ، هەر زۆر زۆر هەڵهای برنج ئەکا.

ڕۆژێك سەرلەبەیان کوتوپڕ گوێی لە دەنگی «دنگ» ئەبێ. خۆی بۆ خۆش ئەکا کە ئەمە برنج ئەکوتن. ئەو ڕۆژە بە یادی برنجەوە، نیوەڕۆ نیوەڕۆژە ناکا ئەڵێ: با ئێوارە زۆر بخۆم. ئێوارە پاش نوێژی شێوان ئاو دێنن و دەست ئەشوا، ئەویش سمێڵی خۆی لێ داوەتە لاوە کە ئێستە پلاو ئەخوا؛

کە نان دائەنرێ سەیر ئەکا هەر گەنمەکوتاوە. بە جارێ ئەچێتە تاسەوە و نایخوا، سکیشی لە برسانا هەر قۆڕەی دێ.

کابرای خانەخوێ پێی ئەڵێ: عاجی ما ناخۆی؟ ئەڵێ: ناخۆم. ئەڵێ: ئاخر کە دەستت شوشت ما ناخۆی؟ ئەڵێ: کورە کە دەستم ششت دەستم لێی ششت.

**۲۹۰.** ژنێکی کورد منالێکی کۆرپەی هەبوو هەڵیئەپەڕان و ئەم بەیتانەی بەسەرا هەڵئەدا:

خوا بیدا نیازم حەو ژنەڕات بخوازم
یەکێ تورك تەماشا یەکێکی دود پاشا
یەکێ ڕای سەرسینە یەکێ ڕای پەڕۆپینە
یەکێکی ڕای دەرکۆلین یەکێکی پەی تیکەگلین
یەکێکیش ڕای چڵم هەڵقۆرین

**۲۹۱.** پیاوێك هەبوو هەژار بوو باسی مەردمی دنیای وا ئەکرد:

نیوەی سوار کڵاش چەکە نیوەی سوار محنەکە
نیوەی غەرق غەزنەی لاڵە نیوەی ئاتاج تۆپێ شاڵە



# تاقی کراوەکانی کوردی

٢٩٢. ئەڵێن: ئەگەر مەڕ تووشی «پزوو» (پەتا) بوو، لنگە کڵاشێک بکەنە ملی لە کۆڵی ئەکەوێ.

٢٩٣. ئەڵێن: ئەگەر منالێ تووشی «باژیلە» بوو، بێنن زراوی گا ـ ئاوە تاڵەکەی ـ لەگەڵ «شەویار» (صبر) پێکەوە تێکەڵاو کەن و بیسوون بەسەر سنگ و موسڵدانیا، باژیلەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

٢٩٤. ئەڵێن: ئەگەر منالی کۆرپە کە بەر چاوەزار و نەفەس کەوت، لە وەختی زەردەپەڕی خۆراوا قانگ بخەنە سەر ئاگر، منالەکە و دایکی منالەکە خۆیانی پیا بگرن نەفەسی چاوەزارەکە نامێنێ.

٢٩٥. ئەڵێن: ئەگەر منالی کۆرپە پەنجە گەورەی پێی خۆی برد بە دەما و مژی ئەوە کوڕ بەشوێن خۆیا دێنێت.

٢٩٦. ئەڵێن: ئافرەتی سکپڕ ئەگەر تۆزێ زیاد «ڕەشکە» (سیاوڵە) بخوات بەرەکەی ئەخا.

٢٩٧. ئەڵێن: ئەگەر پەڕی «سیسارکە کەچەڵە» (رَخمە) لە هەر ماڵێکا بسووتێنن، هەر جڕوجانەوەرێکی زیاندار لەو ماڵەدا هەبێ هەموو هەڵدێن.

٢٩٨. ئەڵێن: ئەگەر ڕیقنەی سیسارکە کەچەڵە لە ژێر ئافرەتی سکپڕدا بسووتێنن بەرەکەی ئەخا.

٢٩٩. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ نینۆکی دەست و پێی پێکەوە بکا دایکی و باوکی پێکەوە ئەمرن.

٣٠٠. ئەڵێن: پیاز لە ماڵا بڕوێنرێ «بەدیومن»ـە و ئەو ماڵە وێران ئەبێ.

٣٠١. ئەڵێن: سەری زل و گوێی بچووك نیشانەی ژیری و زیرەکییە. سەری بچووك زۆر گوێی زلیش نیشانەی بێئەقڵی و نەزانینە.

٣٠٢. ئەڵێن: ژنی سكپڕ بنێشت بجوێ لە پاشا ئەو منالە زۆر کات گوێچکەی ژان ئەکا.

٣٠٣. ئەڵێن: ژنی سكپڕ ئەگەر گۆشتی گا بخوا لە پاشا منالەکەی تووشی باژیلە ئەبێ.

٣٠٤. ئەڵێن: ئەگەر جووجکی تازە لە هێلکە دەرچوو لە دەنووکەوە هەڵبگیرێ ئەگەر جووڵایەوە ئەوە کەڵەشێرە ئەگەر نەجووڵایەوە ئەوە مریشکە.

٣٠٥. ئەڵێن: ئافرەتی سكپڕ کە دڵەکزە بیگرێ ئەوە منالەکەی تووکەسەری هەیە.

٣٠٦. ئەڵێن: منالی ژێر پێی بخورێنێ ورگن ئەبێ.

٣٠٧. ئەڵێن: گوڵی هێرۆ و ناوکە بەهێ، پێکەوە بکوڵێندرێن بکرێن بە چا و پیاو بیخواتەوە بۆ هەلامەت باشە.

٣٠٨. ئەڵێن: ئەگەر منال چووە تەوسەوە بێنن لەو کاتەدا کە تەوسەکە ئەیباتەوە تۆزێ لە جلەکەی بەری لە عاستی ناو مورتخەی

پشتیەوە بە مقەست هەڵێنن بیسووتێنن لەلایەوە، ئەمجا بزمارێکیش لەو عاستەدا ـ واتە ئەو شوێنە کە پیرانەکەی تیا کراوە ـ بکوتن بە ئەرزا، تەوسکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

٣٠٩. ئەڵێن: بە هاوین نینۆك زۆرتر دێ تا زستان.

٣١٠. ئەڵێن: مناڵ کە خەتەنە ئەکرێ ئەو زیادە پێستەی کە ئەیبڕن، هەڵیگرن بە پەتێکەوە وشك ئەبێتەوە، هەروەخت ئەو مناڵە وەیا مناڵێکی‌تر بە «بۆن» کەوت بێنن زیادە پێستەکە بخەنە ناو ئاو و هەڵیفلەقێنن سەر و مێشکی مناڵەکە بشۆن و مەلاشوی هەڵبدەنەوە ـ بەلام پەنجەکە بەو ئاوە تەڕ بکرێ ـ بۆنەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

٣١١. ئەڵێن: یەکێ میز وەیا ئاو بە پشیلە وەیا سەگدا بکا بالووك دەر ئەکا.

٣١٢. ئەڵێن: هەرکەسە زەردەواڵەیەك بکوژێ خورمایەکی لە بەهەشتا ئەدرێتێ.

٣١٣. ئەڵێن: لە کاتی نووسینا ئەگەر قەڵەم سەرو بن هاتە دەستەوە، ئەوە پارە دێتە دەست ئەو کەسە.

٣١٤. ئەڵێن: ئاوی ڕێواس لەگەڵ ئاردی جۆ تێکەڵ بکرێ ئەو کەسەی کە زیپکە وەیا سوورەبای هەیە، لەشی خۆی پێ بهەنوێ چاك ئەبێتەوە.

٣١٥. ئەڵێن: ئاوی ڕێواس بۆ «وەبا، ژانەسەر، زەردوویی و فشاری خوێن» باشە.

٣١٦. ئەڵێن: خواردنی ڕێواس بۆ بەهێزبوونی دڵ و جگەر باشە.

٣١٧. ئەڵێن: قارچك زۆر خواردن ئەبێتە هۆی نەخۆشی کۆڵنج و ورگ و نەهێشتنی تۆوی مناڵ.

٣١٨. ئەڵێن: ژنی سك‌پڕ کە ماری چاو پێ کەوت، مناڵەکە لە پاشا هەر زمان دەردێنێ.

٣١٩. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ تووشی زەحیری بوو سێ ڕۆژ خۆی بگرێتە برنجی ڕۆن کەم خواردن ـ یەعنی قبووڵی ڕۆن ـ چاك ئەبێتەوە.

٣٢٠. ئەڵێن: هەویر کە پەڕی ئەوە میوان دێت.

٣٢١. ئەڵێن: تفەنگێك کە هەزار نێچیری کوشتبێت ئیتر نێچیر لە بەری ڕا ناکا و خۆی ئەدا بەدەستەوە بۆی.

٣٢٢. ئەڵێن: یەکێ سەیری ئەو کەسە بکا کە هەڵواسراوە ـ واتە دراوەتە دار ـ کەم فیکر ئەبێ.

٣٢٣. ئەڵێن: یەکێ ئەسپێ بە زیندوویێتی فڕێ بدا شتی زوو لە فیکر ئەچێتەوە.

٣٢٤. ئەڵێن: ئەگەر مشك لە شتێکی خوارد وەیا خواردەوە، ئەگەر یەکێك لەو شتە بخواتەوە کەم فیکر ئەبێ.

٣٢٥. ئەڵێن: خواردنی سێوی ترش کەم فیکری دێنێ.

٣٢٦. ئەڵێن: زۆر خوێندنەوەی کێلی قەبر ئەبێتە هۆی شت لە فیکر چوونەوە.

٣٢٧. ئەڵێن: یەکێ میز بکاتە ناو ئاوی ڕاوەستاوەوە کەم فیکر ئەبێ.

٣٢٨. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ «سێبەڕۆ»ی هەبوو شاخی گا بسووتێنرێ و تێکەڵاو بە خواردنی بکا و بیخوا سێبەڕۆکەی لەکۆڵ ئەکەوێ.

٣٢٩. ئەڵێـن: ئەگـەر بـە «زراو»ی گا هەر دارێـك بهەنوون ئەو دارە کرم هەڵناهێنێ.

٣٣٠. ئەڵێـن: ڕەقینـەی پێـی گا، بسـووتێنرێ و بهێنرێ بـە دەم و دانا دانەکان سپی ئەبنەوە.

٣٣١. ئەڵێن: خواردنی شـیری مانگای زەرد زەردوێتی لائەبا، ئەگەر لەگەڵ دۆدا بخورێ بۆ نەهێشتنی مایەسیری باشە.

٣٣٢. ئەڵێـن: زراوی بـزن لەگـەڵ «نۆشـادر»دا تێکـەڵاو بکـرێ، لـە لەشـێ ئینسـانا ئـەو شوێنەی کـە مووی هەیـە بیانـەوێ ئیتـر مووی لێ نەیێ مووەکان هەڵکەنن لەو زراو و نەوشادرەی لێبدرێ ئیتر مووی لێنایێ.

٣٣٣. ئەڵێن: بـە شـیری بـزن لەسـەر کاغـەز بنووسـرێ خەتەکـەی دەرناکەوێ، بەڵام کە خۆڵەمێشی پێوەکرا خەتەکە دەرئەکەوێتەوە.

٣٣٤. ئەڵێن: ئەگەر تەنراوی جاڵجاڵۆکە بخرێتە سەر تازەبرین، تەڕی نایەڵێ و خوێنەکەشی ئەوەستێنێتەوە.

٣٣٥. ئەڵێن: زیـوێ کـە ڕەنگی تێك چووبـێ تەنـراوی جاڵجاڵۆکەی پیا بێنن ڕەنگ هەڵدێنێتەوە.

٣٣٦. ئەڵێن: مقناتیسی ئاسنکێش کە «سیر»ی لێ نزیك خرایەوە ئەوا ئەو هێزی ڕاکێشانی نامێنێ، بەڵام کە بە سرکە بیهەنوون هێزەکەی بۆ ئەگەڕێتەوە.

٣٣٧. ئەڵێن: کە حوشتر چاوی بکەوێ بە ئەستێرەی سوەیل هەر خێرا ئەمرێ.

٣٣٨. ئەڵێن: تووکی حوشتر بسووتێنرێ و بخرێتە سەر ئەو شوێنە کە خوێنی ناوەستێتەوە ئیتر گورج خوێنەکە دەوەستێتەوە.

٣٣٩. ئەڵێن: ژنی نەزۆك ئەگەر «مۆخ»ـی لوولاقی حوشتر بپێچێنێ بە تۆوی لۆکەوە یا خورییەوە، لە پاش پاکبوونەوەی لە حەیز، سێ ڕۆژ ئەو شافە هەڵبگرێ و لەگەڵ مێردەکەیا پێکەوە دروست بین سکی پڕ ئەبێ.

٣٤٠. ئەڵێن: نە پیاوی پیر بنێرە بۆ کەر کڕین، نە پیاوی برسی بنێرە بۆ نان کڕین، نە پیاوی گەنج بنێرە بۆ ژن خواستن.

قسەکەش ئەوەیە کە پیاوە پیرەکە لەبەر پیری کەری چاك و خراپ لێك جیا ناکاتەوە، هەر ئەڵێ: پێم لە ئەرز ببڕێ هەر باشە. پیاوە برسییەکەش لەبەر برسێتی نانی چاك و خراپ لێك جیا ناکاتەوە، هەر ئەڵێ: سکم پڕ کاتەوە چاکە. پیاوە گەنجەکەش لەبەر چلێسی ژنی جوان و ناشیرین لێك ناکاتەوە، هەر ئەڵێ: ئیشم جێبەجێ ببێ هەرچۆن بێ هەر باشە.

٣٤١. ئەڵێن: ئەگەر پیاو ڕژد بوو ژنەکەی بە ئازارەوە درەنگ منالی ئەبێ.

٣٤٢. ئەڵێن: یەکێ ئەڵامەتی بێ، نافەکەی دەرپێکەی خۆی بگرێ بە ئاگرا و بۆنی بکا ئەڵامەتەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

٣٤٣. ئەڵێن: ژنی سكپڕ کە ڕووی زەرد و باریك بوو، ئەوە سکەکە کوڕ ئەبێ؛ ئەگەر گەش و پانوپۆڕ بوو، ئەوە کچ ئەبێ.

٣٤٤. ئەڵێن: منالی ساوا ئەگەر کۆشی خۆی گرت و هەڵیدایەوە ئەوە داوای ڕۆژی ئەکا بۆ باوك و دایکی.

٣٤٥. ئەڵێن: منال کە لە بێشکەدا نەبوو بێشکەکەیان ڕاژەند، ئەو مناڵە ژان ئەکا.

٣٤٦. ئەڵێن: چۆلەکە و کێچ لە گوندی «تەوێڵە»دا نییە.

٣٤٧. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ «ذات الجنب»ـی بوو، قرژاڵ بپشێنێ و لێی بنێ، یا ئەیکوژێ یا چاکی ئەکاتەوە.

٣٤٨. ئەڵێن: یەکێ کە چاوی بفرێ، تۆزە نانێکی بخاتە سەر فرینەکەی ئەوەستێتەوە.

٣٤٩. ئەڵێن: مریشك کاتێ هێلکە ئەکا لەو کاتەدا کە هێلکەکە لە قنگی دەرئەچێ، پێش ئەوە هەوای لێ کەوێ ئەو هێلکەیە بەر هەر شتێك بکەوێ، وەیا بکەوێ بەسەر هەر شتێکا وێنەی ئەو شتە وەرئەگرێ.

٣٥٠. ئەڵێن: کەروێشك وتوویە هەر چوار پەلم بە گەڵی ئەو کەیانووە کە ئەمنێتە سەر قبووڵییەوە.

٣٥١. ئەڵێن: ئەگەر مار تەماشای زمرووت بکا کوێر ئەبێ.

٣٥٢. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ «ضغط» (فشار)ـی هەبوو بێنێ ٦٠ دەنك عەناب لەگەڵ مستێ جاتری وشك (ئەگەر جاتری تەڕ نەبوو، ئەگینا ئەگەر تەڕیش بوو ئەوەندە بێ کە ئەگەر وشك کرێتەوە مستێك بگرێتەوە) سەرلەئێوارە بیکاتە ناو خامێك و نزیکەی پێنج شەش پیاڵە ئاوی تێ‌کا، تا بەیانی لەناو ئاوەکەدا بمێنێتەوە، بە تەواوی تام ئەداتەوە. ئیتر هەر لەناو ئەو ئاوەدا بمێنێتەوە، ئەمجا بێنێ هەموو نان‌خواردنێك ئیستکانێکی لێ بخواتەوە، ئەتوانێچ دوو سێ ڕۆژیش هەر جارە کە ئیستکانەکەی لێ ئەخواتەوە ئیستکانێکی‌تر ئاوی تێ‌کاتەوە؛ کە ئەو ژەمە تەواو بوو دیسان هەروەکوو وترا ژەمێکی‌تر بگرێتەوە، بەم جۆرە ماوەیەك لە سەری بڕوا زەختەکەی نامێنێ و لە کۆڵی ئەکەوێ.

٣٥٣. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ گوێی ژان بکا پیاز بپیشێنێ، کرۆکەکەی هێشتا بە تەواوی سارد نەبووتەوە، بینێتە ناو کونی گوێی ئیتر ژانی نامێنێ.

٣٥٤. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ گوێی هاتە ژان تۆزێ «کەرە»، بە ئەندازەی کەوچکە چایێك تۆزێ گەرمی کا و بیکاتە ناوی چاك ئەبێتەوە.

٣٥٥. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ میزی ڕانەئەگرت «بەڕوو» بکوڵێنێ، ئاوەکەی بخواتەوە، وەیا بەڕووەکە بە برژاوی بخوا، میزەچرکەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

٣٥٦. ئەڵێن: یەکێك ئەگەر دەردی بەڵەکی هەبوو، بە پێی پێخاوس بە هەر شوێنیکا بڕوا ئەو شوێن پێیەی ئیتر گیای لێ ناڕوێ!.

٣٥٧. ئەڵێن: پیاوی کوێر زۆر حەز لە ژن ئەکا و پیاوی خەساو چاوی زۆر تیژە.

٣٥٨. ئەڵێن: یەکێ نەخۆشی شەکری هەبێ خۆی بگرێتە خواردنی «شەوەر» (سێپەڕە) نەخۆشییەکەی بە تەواوی لێ ئەکەوێ.

٣٥٩. ئەڵێن: کچ و ژن بەوە جیا ئەکرێتەوە: کچ هەڵئەستێ بڕوا لە پێشا پێی چەپی پێش ئەخا، ژن پێی ڕاستی پێش ئەخا.

٣٦٠. ئەڵێن: یەکێ سکی بچێ بە ئەندازەی ئیستکانێ ئاوی پوونگە بخواتەوە لە کۆڵی ئەکەوێ؛ واتە پوونگەکە ئەگەر تەڕ بوو ئاوەکەی بگوشن، ئەگەر وشك بوو ئاوی تێکەن، ئەوەندەی بکوڵێنن تا ئاوە ساغەکەی خۆی ئەمێنێتەوە.

٣٦١. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ سکی بچێ نۆك بخوا ئەیوەستێنێتەوە.

٣٦٢. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ دەنگی بنووسێ، فنجانێ قاوەی تاڵ، «ڕۆنی زەنگ»ـی تێبکرێ و بیخواتەوە دەنگەکەی بەرەڵا ئەبێ.

٣٦٣. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ دەنگی بنووسێ «کەبابی چینی» بخوا دەنگەکەی بەرەڵا ئەبێ. ئەمەیان من خۆم تاقیم کردەوە زۆر ڕاست بوو، برایم خان پێی وتم.

٣٦٤. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ برینـدار بوو، برینەکە لە گۆشتدا بوو، میزی مانگای زەرد بێنن بیکوڵێنن، ئەوەندە بکوڵێ تا ئەبێ بە مەعجوون، ئەمجا بیکەن بە فتیلە، ئەگەر برینەکە کۆن بوو هەر لێی بنێن چاك ئەبێتەوە.

٣٦٥. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ تووشی «سێبەڕۆ» بوو سیر بێنی وەکوو چۆن دەنك‌دەنکە و دەنکەکانی پێکەوە نووساون لێکیان بکاتەوە. ئەمجا ئەو دەنکانە بە دەرزی کون‌کون بکا بە جۆرێ کە کونەکان

دیوەودیو ببن، دەنکێ چەند کونی وای تێبکا. لە وەختی نوستنا ئەو دەنکانە قووت بدا، یەك دوو شەو وا بکا سێبەرۆکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

٣٦٦. ئەڵێن: بۆن کردنی ڕەیحانە بۆ هەلامەت باشە.

٣٦٧. ئەڵێن: ئەگەر مار چاوی بە ئینسانی ڕووت بکەوێ لێی هەڵدێ.

٣٦٨. ئەڵێن: چای وشك لەگەڵ زەردێنەی هێلکە بکرێ بە مەعجوون و بکرێ بە شاف ئەو کەسەی سکی ئەچێ هەڵیگرێ بۆی باشە.

٣٦٩. ئەڵێن: یەکێ «وشکەبیرۆ»ی هەبوو لیمۆی ترش بە توێکڵەکەیەوە بەسەر یەکا بگووشرێ و ئاوەکەی بگیرێ، سێ ئیستکان لەو ئاوە بخواتەوە چاك ئەبێتەوە.

٣٧٠. ئەڵێن: یەکێ نەخۆشی شەکری هەبوو ناوکی خورما بهاڕێتەوە ورد ورد. پاشان وەکوو قاوە لێی بنێ و بیخواتەوە چاك ئەبێتەوە.

٣٧١. ئەڵێن: یەکێ هەر ئەڕشایەوە قۆنیاخی بدەنێ چاك ئەبێتەوە.

٣٧٢. ئەڵێن: یەکێ پێکەنین بیگرێ سەیری نینۆکی خۆی بکا پێکەنینەکەی لا ئەچێ.

٣٧٣. ئەڵێن: لەو کوردەوارییە لە ئاواییێکا کە سەگی ڕەش لوورانی، ئەوە بەلایەك دێت بەسەر ئەو ئاواییەدا و سەگەکە لە دوورەوە چاوی لێیە، ئەلوورێنێ ئەڵێ: لەم ئاواییە دوور بێت؛ کە بەلاکە نزیك کەوتەوە ئەو هەر ئەلوورێنێ و ئەڵێ: لە ماڵی خاوەنەکەم دوور بێت؛ کە بەلا هات و ڕووبەرووی ئەو زۆر نزیك کەوتەوە، کلك ئەگرێ بەناو گەڵیا و بە لوورە ئەڕوا و ئەڵێ: «لە خۆم بەدوور بێ».

◈◇◈



عاشقی وشەی خاوێنی کورد، کەلەپیاوی بەدەستوبرد، هۆگری دابونەریتی کوردەواری، کۆکەرەوەی کەلەپوور لە دێهات و شاری، زیندووکەرەوەی شادی، شێخ عەلائەددینی سەججادی.

ناوی «عەلائەددین نەجمەددین عیسامەددین»ە و لە بنەماڵەی ناوداری «سەججادی»یە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. لە ساڵی ۱۹۰۷ی زایینی لە سنەدا هاتۆتە دنیاوە و لە کۆشی خێزانێکی ئایینیدا پەروەردە کراوە. لە ساڵی ۱۹۳۸ی زایینی ئیجازەی مەلایەتی لای مامۆستا «شێخ بابەعەلی تەکیەیی» وەرگرتووە و چووە بۆ بەغدا و لە مزگەوتی «نەعیمە خاتوون» بووە بە پێش‌نوێژ. لە بەغداش لای مامۆستایان شێخ «ئەمجەدی زەهاوی» و شێخ «محەممەدی قزڵجی» بە هەندێ لە زانستە ئیسلامییەکاندا چۆتەوە. لە ساڵی ۱۹۳۹ی زایینیدا چۆتە مەیدانی ڕۆژنامەنووسی و لە ۱۹٤۱دا بووە بە بەڕێوەبەری گۆڤاری «گەلاوێژ» و وردە وردە بووە بە هەمەکارەی و تا داخستنی لە ۱۹٤۹دا لەگەڵی بووە.

لە ساڵی ۱۹٤۸دا گۆڤاری «نزار»ی بە عەرەبی و کوردی دەرکردووە، کە گۆڤارێکی نیشتمانپەروەری و سیاسی بووە. تا ساڵی ۱۹۷٤ مامۆستای وێژە و مێژووی وێژەی کوردی بووە لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا. لە ساڵی ۱۹۷٤دا کرا بە ئەمینداری گشتی ئەوقاف و سێ ساڵ لەو کارەدا ماوەتەوە.

ئێوارەی ڕۆژی پێنج‌شەممەی ۱۹۸٤/۱۲/۱٤ی زایینی، کۆچی‌دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە نزیکی شێخ عەبدوڕڕەحمانی ئەبولوەفای نەقشبەندی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە کۆشی خاک سپێرراوە.

عەلائەددینی سەججادی زیاتر لە چل ساڵ خەریکی زیندووکردنەوەی کەلەپوور و نووسینی مێژووی وێژەی کورد بوو. تێکۆشانی بێ‌وچانی ئەم پایەبەرزە نەیهێشت کە گەنجینەی کەلەپووری نەتەوەکەمان بفەوتێ.

**ناوی بەرز و ڕۆحی شاد بێت**




انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنندج ـ پاساژ عزتی ـ تلفن: ۳۳۱۶۵۳۸۲





جلد پنجم
9 789649 804163





شابک دوره
9 789649 804118